# هەندێ لادانی زمانی لای سێ شاعیری نوێخوازی کورد

ئەنوەر مەسیفی ـ نەوزاد رەفعەت ـ فەرهاد پیربال

دلێر سادق کانەبی

# هەندێ لادانی زمانی
# لای سێ شاعیری نوێخوازی کورد

## لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانییە

دلێر سادق کانەبی

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● هەندێ لادانی زمانی لای سێ شاعیری نوێخوازی کورد

● نووسینی: دلێر صادق کانەبی

● بابەت: نامەی ماستەر

● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

● پیتچنین: نووسەر

● بەرگ: ئاسۆ مامزادە

● چاپ: یەکەم ٢٠٠٩

● ژمارەی سپاردن: ٩٣٣

● نرخ: ١٥٠٠ دینار

● تیراژ: ٧٥٠

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٣٩٢)

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

پێشکەشە بە:

دایك و باوکی بەڕێز

و

خوشك و برا خۆشەویستەکانم

## سوپاس و پێزانین

سوپاسی د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم دەکەم کە سەرپەرشتی باسەکەمی گرتە ئەستۆ.

سوپاس بۆ د. رەفیق محەمەد شوانی کە هەمیشە قەرزاری جەنابیانم.

سوپاس بۆ د. یوسف شەریف کە بەردەوام وەلامی پرسیارەکانی داوەتەوە.

سوپاس بۆ م. جەبار جەمال و نوزاد حسن و مراد حەکیم.

# پێرست

# پێرستی وێنه و هێلکارییەکان

## پێرستی خشتەکان

## ٠- پێشەکی

### ٠-١- ناونیشان

ناونیشانی باسەکە (هەندێ لادانی زمانی لای سێ شاعیری نوێخوازی کورد- لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانییە) یە و هەوڵمان داوە لە لادانی واتایی، لادانی لێکسیکی، لادانی نووسینی، لادانی شێوازی و لادانی زاری بکۆڵینەوە کە ئەم شاعیرانە لە شیعرەکانی خۆیاندا پەیڕەوییان کردووە بەمەستی داهێنانی دەقی شیعری.

### ٠-٢- هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکە

١- هۆی هەڵبژاردنی باسەکە دەگەڕێتەوە بۆ تازەیی بابەتەکە و گرنگی بابەتەکە، چونکە لادان وەك جۆرێکی زەقکردنەوەی ئەدەبی دەبێتە هۆی داهێنانی دەقی شیعری و جیاکردنەوەی لە دەقەکانی تری ئەدەبی.

٢- هەڵبژاردنی ئەم سێ لادانە بۆ ئەوە دەگەڕێتە کە لادانی واتایی لە هەموو لادانەکانی تر زیاتر بەکاردێت، لادانی لێکسیکیش رۆڵێکی گەورەی هەیە لە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمان و لادانی نووسینیش یەکێکە لە سیماکانی شیعری نوێ.

### ٠-٣- گیروگرفتەکانی باسەکە

لەکاتی نووسینی باسەکە گیروگرفتێکمان هاتۆتە پێش ئەویش کەمی سەرچاوەی کوردیە.

### ٠-٤- رێبازی لێکۆڵینەوە

رێبازی لێکۆڵینەوەی ئەم باسە بەپێی ئەو شێوازەیە کە **لیچ** (١٩٦٩) وەکو رۆنانکاریی تایبەت بۆ لادانی خستۆتەڕوو.

## ٠-٤-١ کەرەسەی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەیان

هەموو ئەو شیعرانەی کە مەبەستمان بووە چەند جارێك خوێندوومانەتەوە و نموونەی هەریەکە لە سێ لادانەکەمان دەستنیشان کردوون و بەش بەشمان کردوون، هەریەکە لەم بەشانەش بەگوێرەی توانا زیاتر لێیان دەکۆڵینەوە و بەسەر چەند بەشێکی تردا دابەشمان کردوون، دواتر بە سوود وەرگرتن لە زمانەوانیی ئاماریی ڕێژەی سەدی هەر یەکەیانمان نیشان داوە. بەم شێوەیە ڕێژەی بەکارهێنانی هەر سێ لادان لای هەر یەکە لە شاعیرەکانمان دەستنیشان کردووە، کە خۆی لە خۆیدا بۆ ناسینەوەی شێوازی هەرسێ شاعیر گرنگە. بەو واتایەی کە دەستنیشانی ئەوەمان کردوون کە کام لەم لادانانە لای کام شاعیر زیاتر بەکارهاتووە، بەراوردی هەر سێ لادانمان لای هەریەکە لە شاعیرەکان کردووە.

## ٠-٥- ئامانجی باسەکە

ئامانجی ئەم باسە ئەوەیە کە لە سێ لادانی (واتایی، لێکسیکی و نووسینی) لای هەرسێ شاعیر بکۆڵینەوە. دەستنیشانی ڕێژەی بەکارهێنانی هەر پێنج لادان لای هەریەکە لەم سێ شاعیرە بەجیا دەکەین و دواتر بەراوردی ڕێژەی بەکارهێنانی لادانەکان لای هەریەکەیان و پاشان بەراوردی ڕێژەی بەکارهێنانیان لای هەرسێکیان بکەین.

## ٠-٦- گرنگیی باسەکە

لەم باسەدا هەوڵمان داوە لە ڕێگەی دەستنیشان کردنی پێنج لادان لە لای ئەم سێ شاعیرە، شێوازی شاعیر لە داهێنانی ئەدەبی لای هەر سێ شاعیر روون کردۆتەوە و ئەوەشمان نیشان داوە کە ئەم لادانانە، زمانی لە ئەرکی گەڕانەوەیی (زمانی خۆکار) دوور خستۆتەوە و لە ئەرکی ئەدەبی (زمانی بەرجەستەکراو) نزیك دەکاتەوە.

## ٠-٧- بەشەکانی نامەکە

ئەم نامەیە لەم بەشانەی خوارەوە پێکهاتووە:

### بەشی یەکەم- هەندێ لایەنی تیۆری:

لەم بەشەدا سەرەتا باسمان لە پەیوەندی زمانەوانی بە زانستەکانی ترەوە کردووە و ئینجا چوینەتە سەر ئەرکەکانی زمان و پاشان باسمان لە ئەرکی ئەدەبی کردووە و دواتر پێشینەیەکی کورتمان لەبارەی لادان خستۆتە روو و دوای ئەوەش جۆرەکانی زمانی ئەدەبیمان روون کردۆتەوە و دواترش باسمان لە جۆرەکانی زمانی ئەدەبیی کوردی لە رێگەی هێنانەوەی کۆمەڵێك تێکستی ئەدەبییەوە کردووە.

### بەشی دووەم- جۆرەکانی لادان

لەم بەشەدا بە درێژی باس لە جۆرەکانی لادان کردووە و بە هێنانەوەی نموونەی پێویست روونمان کردوونەتەوە.

### بەشی سێیەم- شیکردنەوەی کەرەسەکان

لەم بەشەدا دوای دەرهێنانی هەریەکە لە لادانی واتایی، لادانی لێکسیکی و لادانی نووسینی کە لای سێ شاعیری ناوبراو و چەند نموونەیەك لەو کەرەسانەی کە بینراون خستۆتە روو و بەسوود وەرگرتن لە ئامار و هێلکاری رێژەی سەدی هەر یەکەیانمان نیشان داوە. ئینجا لە شێوازی تایبەتی هەریەکەیان لە بواری لادان و رێژەی سوود وەرگرتنیان لە هەر یەکە لە سێ لادانەکە کۆڵیوەتەوە و بەگوێرەی توانا ئەنجامەکان بەدەستەوە داوە. لە کۆتایی شیکردنەوەی هەموو لادانەکان ئەو دەقانەی نێو دیوانەکان کە لادانانەکانی تیادا ئەنجام دراوە، لادانەکانی هێڵیان بەژێردا کێشراوە و بەتۆخی و بە شێوەی ئیتاڵیك نووسراونەتەوە.

## ٨-٠ ئەنجام

لەم بەشەدا ئەو ئەنجامانەی کە بەدەست هاتوون شی دەکردۆتەوە و ڕێژەی بەکارهێنانی ئەو جۆرانەی لادان، کە دەتوانین بۆ ناسینەوەی شێوازی هەر یەکەیان سوودی لێ وەربگرین، باس کردووە.

## ١-١- پەیوەندیی زمانەوانی بە زانستەکانی ترەوە:

زمانەوانی وەك هەر زانستێکی دیکە، لەڕێگەی پەیوەندی کردن و سوودوەرگرتن لە زانستەکانی تر و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرفراوانتر دەبێ و لقی زیاتری لێ دەبێتەوە. **ژان پیتار** (j.petart) لە هێلکارییەکدا پەیوەندی زمانەوانی بە زانستەکانی تردوە لە ڕێگەی بەکارهێنان و تێك چڕژان و وەرگرتنەوە ڕوون دەکاتەوە(منصور ستودە، ١٣٨٥/٢٠٠٤: ٢):

ئیچسۆن یش کاتێك باس له بەرفراوانیی زمانەوانی و سەختی دەستنیشانکردنی سنوورەکەی دەکات، هێلکارییەك دەخاتەروو و لەرێگەی ئەو هێلکارییەوە هەوڵ دەدات پەیوەندیی زمانەوانی بە زانستەکانی تر و لقەکانی زمانەوانی روون بکاتەوە.(جین ئیچسۆن،١٣٨٢/٢٠٠١: ٩)

هێلکاریی ژمارە (٢)

هێلکاریی ئیچسۆن بۆ لقەکانی زمانەوانی

ئەم دوو زمانەوانە لەرێگەی دوو هێلکاری جیاوازەوە پەیوەندی زمانەوانییان بە زۆر زانستەوە روون کردۆتەوە.ئێمەش لێرەدا باس لە هەندێك لەم پەیوەنییانە دەکەین:

### ١-١-١- زمانەوانیی دەروونی

ئەم لقەی زمانەوانی وەك لە ناوەکەی دەردەکەوێ بریتییە لە پەیوەندی زمانەوانی بە دەروونزانییەوە. دەتوانین بەگشتی بواری کارکردنی ئەم لقە زانستەش لەم خالآنەدا کورت بکەینەوە:

١- بەرهەمهێنانی زمان(Production): چۆنیەتی گۆڕانی زانیاری بۆ شەپۆلە (ئاکۆستیکیەکان) فیزیاییەکان، نیشانە و یا شێوەکانی نووسین.

٢- درککردن(Coprehension): چۆنیەتی لێکدانەوەی سیگنالەکانی بینین و یا ئاکۆستیکیەکان لەلایەن بەردەنگ (گۆێگر) یا خوێنەرەوە.

٣- فێربوون(Acquisition): چۆنیەتی فێربوونی کارامەییەکانی زمانی یەکەم و زمانی دووەم.

٤- تێکچوونەکانی زمان(Lg Disorders): چ هۆکارێك دەبێتە هۆی روودانی تیچکچوونە بەردەوامەکان یا کاتییەکانی قسەکردن و سیستەمەکانی گۆڕینی زمان.

٥- زمان و بیر(Lg and thought): ئەرکی زمان لە بیری مرۆڤ و لێکۆڵینەوەی کاریگەریی زمانە جیاوازەکان لەسەر بیر.

٦- زانین و دەمار(Neurocognition): چۆنیەتیی رۆنانی زمان و گۆڕینی لە مێشك و لێکۆڵینەوەی تێکچوونی مێشکیی زمان بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئاگایی زیاتری جۆری کارکردنی زمان لە مێشکدا.

**١-١-٢- زمانەوانیی کۆمەڵایەتی**

ئەم لقەی زمانەوانی لە پەیوەندی نێوان زمان و کۆمەڵ دەکۆڵێتەوە. بەواتایەکی تر باس لە ئەرکی کۆمەڵایەتی زمان دەکات.

لەم بوارانە دەکۆڵێتەوە:

١- زارە کۆمەڵایەتییەکان

٢- زمانی پیشە(jargon)

٣- زمانی عامیە(slang)

٤- تابۆ(taboo)

٥- بەرنامەرێژیی زمان و چەندین بابەتی تر.

**١-١-٣- پەیوەندی نێوان زمان و لۆژیك**

لەم دواییانەدا بە کارهێنانی لۆجیکی نوێ لە زمانەوانیدا لە دوو رووەوە سەرنجی دراوەتێ (محمد رضا باطنی:١٣٧٦/١٩٩٥، ٢٥):

١- بە بێ سوود وەرگرتن لە چەمکەکانی لۆژیکی نوێ زۆربەی کێشە ئاڵۆزەکانی واتاسازی ناتوانرێ چارەسەربکرێن.

٢- لەم ساڵانەی دواییدا زمانەوانی بە شێوەیەکی بەرچاو لە هەموو بوارەکانی (فۆنۆلۆژی، وشەسازی، رستەسازی و هتد) سوودی لە لۆژیکی بیرکاری وەرگرتووە.

**١-١-٤- زمانەوانیی کۆمپیوتەری**

ئەم لقە زانستە لە زۆر لایەن دەکۆڵێتەوە لەوانە(محمد رضا باطنی:١٣٧٦/١٩٩٥، ٢٦):

١- ناسینەوەی قسە(Speech Recognition).

٢- لێکدانی قسە یا قسەی دروستکراو(Speech Synthesis).

٣- ئامادەکردنی فەرهەنگە میکانیکییەکانی دوو زمانە یا فرەزمان.

٤- ئامارگیریی زمانەوانی بۆ ئامادەکردنی فەرهەنگە فریکوێنسییەکان و پێویستییەکانی تری ئامار.

٥- کۆمپیوتەر وا لێ بکرێ کە درك بە رستەی زمانی سرووشتی بکات و پێشاندانی کاردانەوە کە درك پێ کردنی رستەکان بگەیەنێ.

٦- وەرگێڕانی ئامێری.

### ١-١-٥- زمانەوانیی دەماری/ دەمارناسیی زمان

بەکورتی دەتوانین بڵێین دەمارناسیی زمان لەم لایەنانە دەکۆڵێتەوە (محمد رضا باطنی:١٣٧٦/١٩٩٥، ٣٥-٣٦):

١- چۆن زانیارییەکان لەبارەی زمان لە مێشکدا دادەکرێن و دەبرێن و دەگۆڕێن.

٢- بوون و نەبوونی هەندێ سەنتەری تایبەت بە زمان لەمێشکدا و هەندێ لایەنی تر.

سەرەڕای ئەم لایەنانە دەتوانین بڵێین زمانەوانی پەیوەندی بەزۆر لایەنی ترەوە هەیە کە ناکرێ لێرەدا باس لە هەموویان بکەین.

زۆربەی ئەوانەی باس لە پەیوەندی زمانەوانی بە زانستەکانی ترەوە دەکەن جەخت لەسەر پەیوەندی زمانەوانی بە ئەدەبەوە دەکەنەوە.ئەدەب یەکێکە لەو بابەتانەی کە پەیوەندیەکی پتەوی بە زمانەوانییەوە هەیە.زۆربەی زمانەوانان تەنانەت لێکۆڵەرانی ئەدەبیش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە دەبێت لە رووی زمانەوانییەوە لە ئەدەب بکۆڵرێتەوە.فۆرمالیستە رووسەکان لە روانگەی زمانییەوە لە ئەدەبیان دەکۆڵیەوە و زمانی ئەدەبیان بە جۆرێك لە زمان دەزانی و جیایان دەکردەوە لە زمانی زانست،زمانی هەواڵ و زمانی رۆژانە.د.شەمیسا لەم بارەیەوە دەڵێ: ((بە بڕوای فۆرمالیستەکان ئەدەبیات کێشەیەکی زمانیی سرفە و هەر بۆیەش دەتوانرێ بگوترێ زمانی ئەدەبی یەکێکە لە جۆرەکانی زمان و دەبێ لە رووی زمانەوانیەوە لێی بڕوانرێ)) (سیروس شمیسا: ١٣٨٥/٢٠٠٤، ١٦٢). هەروەها **یاکۆبسن**

(R.Jakobson) پێی وایە ئەدەب بەشێکی زمانەوانییە و تەواوکەرییەتی.**ڕۆبەرت سکولزیش** وای بۆ دەچێ کە هەم زمانەوان ناتوانن بایەخ بە ئەدەب نەدەن و هەم لێکۆڵەرەوانی ئەدەبیش ناتوانن زمانەوانی پشت گوێ بخەن.(رابرت اسکولز: ٢٠٠٢/١٣٨٣، ٤٤) **حەق شناس** یش ئەو گوتەیەی **کەدکەنی** کە دەڵێت "زمانەوانی رووداوێکە لە زماندا روودەدات"(محمد رضا شفيعى كدكنى: ١٩٧٣/١٣٥٤، ٣) دەکاتە بەڵگە بۆ ئەوەی کە ڕێگە بە زمانەوان بدات کە لە ئەدەبیات بکۆڵێتەوە و لەم بارەیەوە دەڵێت: (( زمانەوانی بەم بۆنەیەوە مافی ئەوەی هەیە دەست بخاتە نێو کاری لێکۆڵینەوەی ئەدەبییەوە کە ئەدەبیات،بەگوتەی **شەفیعی کەدکەنی**،"رووداوێکە لە زماندا روبدات" و ئەگەر ئەم رووداوە لە زماندا روودەدات،زمانەوان ناچارە بزانێت ئەم رووداوە زمانییە چیە.بێگومان ئەگەر بایەخ بەم رووداوە زمانییە نەدات بەشێکی بابەتی کارەکەی لە بەرچاو نەگرتووە و نەیناساندووە.)) (على محمد حق شناس:١٩٩٢/١٣٧١، ١٠٣) بەرلەوەی کە بچینە سەر زمانی ئەدەب پێویستە سەرەتا بزانین کە زمان چەند ئەرکی هەیە و دواتر شوێنی زمان ئەدەب لە نێو ئەم ئەرکانەدا دیاری بکەین.

## ١-٢- ئەرکەکانی زمان:

زمان وەکو دیاردەیەکی ئاڵۆز فرە ئەرکە و زمانەوانەکان کۆك نین لەسەر جۆر و ژمارەی ئەرکەکانی. مارتنی (A.Martinet)سێ ئەرکی زمانی دەستنیشان کردووە (پەیوەندی بەرقەرارکردن، قسەی دڵ و جوانی داهێنان).(آندره مارتينه،٢٠٠١/١٣٨٢: ١٠-١١) بۆلەر (K.Bühler) یش سێ ئەرکی دەرکەوتن و دەربڕین و وروژاندن بۆ زمان دیاری دەکات (كورش صفوى،/١٣٧٤ /١٩٩٣: ٣٠)" کەچی **هالیدەی** (M.A.K.Halliday) سێ ئەرکی هزرەکی و ئەرکی نێوکەسی و ئەرکی دەقی بۆ زمان دیاری دەکات، بەڵام **یاکۆبسن** لەسەر بنەمای بەشەکانی پەیوەندی کردن شەش ئەرکی زمان دەستنیشان دەکات و پێی وایە کە بۆ بەرقەرارکردنی پەیوەندی، شەش بەش

بەشداری دەکەن. نێرەر پەیامێك لەرێگەی کەناڵی پەیوەندی بۆ وەرگر دەنێرێت. ئەوپەیامەش کاتێك کاریگەری دەبێت کە واتایەکی هەبێت و دەبێت لەلایەن نێرەرەوە بکرێت بە کۆد و لەلایەن وەرگرەوە کۆدەکەی لێك بدرێتەوە. هەرچی **ویلیام هویزە** نۆ ئەرك بۆ زمان دیاری دەکات کە ئەمانەن:

### ١-٢-١- ئەرکی وەسفی (Descriptive)

لەم ئەرکەی زماندا وەسفی شتێك دەکرێ یان دەتوانین بڵێین گواستنەوەی زانیاریی واقعییە لە بارەی شتێکەوە. ئەم ئەرکە لەلایەن **جۆن لاینزیشەوە** بە وەسفی و لەلایەن **بۆلەرەوە** دەربڕینی و **یاکۆبسن** ناوی ناوە گەڕانەوەیی (کورش صفوی،/١٣٧٤/١٩٩٣: ٣٢). بۆ نموونە:

- ئەم کتێبە باشە.

یا

- ئێستا کۆمپیوتەرێکی نوێ و باشت بۆ دێنم.

### ١-٢-٢- ئەرکی هەڵسەنگاندن (Evaluative)

کاتێك کە دەمانەوێ شتێك هەڵبسەنگێنین ئەوا سوود لە ئەرکی هەڵسەنگاندن وەردەگرین. وەکو/

- ئازاد باشترین یاریزانی یانەکەتانە.
- ئەم ئۆتۆمبێلە بێ کەلکە.

### ١-٢-٣- ئەرکی عاتفی (Emotive)

لەم ئەرکەدا زمان بە مەبەستی دەربڕینی هەست و سۆز بەکاردێت. ئەم ئەرکە لە لایەن **یاکۆبسن** یشەوە ئاماژەی پێکراوە و **مارتنی** ناوی ناوە قەسەی دڵ (آندره مارتینە: ١٣٨٢/٢٠٠١: ١٠-١١) (کورش صفوی،/١٣٧٤/١٩٩٣: ٣١).

بۆنموونە:

- من ئەم گوڵەم زۆر لا جوانە.

- خودایە زۆر شوکر کە رزگارت کردم.

### ١-٢-٤- ئەرکی هەست بزواندن (Evocative)

لەم ئەرکەدا نێرەر هەستی وەرگر دەبزوێنێ. زیاتر شاعیر و ئەوانەی کە کاری ریکلام دەکەن و ...هتد سوود لەم ئەرکە وەردەگرن.بۆنموونە/

- ئای لە ئەحواڵی ئەم زەمانە لە کایەی منداڵ دەچێ

دنیایەکی چ پووچە لە زەرفی بەتاڵ دەچێ

- هەر کتێبێك دەکڕی بیکڕە بەڵام ئەم کتێبە مەکڕە(واتە تەنها ئەم کتێبە بکڕە.)

### ١-٢-٥- ئەرکی هاندان (Persuasive)

لەم ئەرکەدا نێرەر هانی وەرگر دەدات بۆ ئەوەی کارێك ئەنجام بدات. بەواتایەکی تر بڵێین داوایەکی لێ دەکات و یا ... . **یاکۆبسن** بە کەمێك جیاوازییەوە ئەم ئەرکەی ناوناوە ئەرکی هاندەری. (کورش صفوی،١٣٧٤/١٩٩٣: ٣١)

- بۆ ئەوەی زیاتر شارەزای ئازاد بیت، گەشتێکی لەگەڵدا بکە.

### ١-٢-٦- ئەرکی پرسیار (Interrogative)

زۆر جار بۆ بەدەستهێنانی زانیاری سوود لەم ئەرکەی زمان وەردەگرین و پرسیار لە بەرامبەرەکەمان دەکەین.

- چەند ساڵت خوێندووە؟

### ١-٢-٧- ئەركی فەرماندان (Directive)

ئێمە هەندێ جار فەرمان دەدەین بە یەكێك بە ئەنجام دان یا ئەنجام نەدانی كارێك.

- چایەكەت بخۆ و برۆ.

### ١-٢-٨- ئەركی كردەیی (Performative)

هەندێ رستە هەن كە خۆیان لە خۆیاندا كردەن.

- من وەكو دادوەر بڕیارمدا بە تاوانباركردنی ئازاد بە تاوانی كوشتن.

ئەم منداڵە ناو دەنێم، شۆخە.

### ١-٢-٩- ئەركی هونەركاری (Recreation)

گەلێ جار زمان بۆ مەبەستی گاڵتە كردن و نوكتە و پێكەنین بەكاردێنین و یاری بە وشە دەكەین. هەروەها بەمەبەستی سەرگەرمی خومان و دەوروبەرمان شیعری گاڵتە ئامێز و چەندین بابەتی تر بەمەبەستی چێژ بەخشین سوود لەم ئەركە وەردەگرین.

### ١-٣- ئەركی ئەدەبی:

بەپێی پێناسەی **یاكۆبسن** بۆ ئەركی ئەدەبیی زمان كە لەسەر بنەمای ئاراستەی پەیامە بۆ بەشەكانی پەیوەندی كردن، لەم ئەركەی زماندا، ئاراستەی پەیام بەرەو ناوەڕۆكی پەیامەكەیە(كورش صفوی،١٣٧٤/١٩٩٣: ٣٠). واتە خودی پەیامەكە. بەواتایەكی تر لێرەدا پەیام خۆی لەخۆیدا دەبێتە جێی باس. بەڵام ئەمە بەو واتایە نییە كە شاعیر یا نووسەر لەكاتی نووسینی دەقێكی ئەدەبیدا سوود لە ئەركەكانی تری زمان وەرناگرێت بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە ئەركە ئەدەبییەكە زەقتر دەبێ لە ئەركەكانی تر ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە مەبەست لە گەیاندنی ناوەڕۆكی

پەیامەکەیە و ئەمیش مەبەستێکی لەدوایە. بەدەربڕینێکی تر ئەوەی کە ئەم دەقە ئەدەبییە دەخولقێنێ، ئەرکە ئەدەبییەکەیەتی نەك ئەرکەکانی تر.

فۆرمالیستە رووسەکان پێیان وابوو هەموو ئەو شتانەی کە لەدەوروبەرمانن لەئەنجامی بەکارهێنان و دووبارەبوونەوەیان دەسوێن و بەمەش ناکەونە بەر سەرنجی ئێمەوە. شکۆلۆفسکی پێی وایە خۆکارکردن شتەکان دەسوێنێت، جل و بەرگ، مۆبیلیات و. . . هتد دەسوێنێت.( **ریچارد هارلند: ١٣٨٥/٢٠٠٤: ٢٤١**) زمانیش وەکو هەموو شتەکانی تری دەوروبەرمان لەئەنجامی زۆر بەکارهێنان کۆن دەبن و ئەم پرۆسەیەشیان ناونابوو خۆکاربوون. هەر فۆرمالیستە رووسەکانیش بوون کە دوو پرۆسەی خۆکاری و زەقکردنەوەیان لە یەکتر جیاکردەوە. هاڤرانك (B.Havranek) لەو بڕوایەدا بوو کە خۆکاری زمان لە بنەڕەتدا بە واتای بەکارهێنانی توخمەکانی زمان دێت، بەئامانجی دەربڕینی بابەت و ناوەڕۆك، بەبێ ئەوەی کە شێوەی دەربڕین سەرنج راکێش بێت.( **مهیار علوی مقدم،١٣٨٣/٢٠٠٢: ٨٢**) زمانی رۆژانە زمانێکی خۆکارە بەو واتایەی کە لەکاتی قسەکردندا سەرنجی مرۆڤ راناکێشێت بەڵکو ئەرکی تەنها گەیاندنی پەیامەکەیە. شکۆلۆفسکی لەو بڕوایەدا بوو کە واتای هونەر لە توانای"ئاشنایی سڕینەوە"ی شتەکان، لەنیشاندانیان بەشێوەیەکی نوێ و چاوەڕوان نەکراودا شاردراوەتەوە. لە ژیانی رۆژانەدا، ئێمە شتەکان و دەوروبەریان نابینین، چونکە درك پێ کردنی ئێمە بەگوێرەی راهاتن و بەشێوەیەکی خۆکار کاردەکات.( **میمنت میر صادقی:١٣٨٥/٢٠٠٤: ١١-١٢**) هەر ئەم خۆکارییەشە وادەکات کە مرۆڤ سەرنج نەداتە شتەکانی دەوروبەری خۆی، لەوانەش زمانەکەی.

ئەرکی ئەدەبیات سڕینەوەی ئەم ئاشناییە و نەهێشتنی ئەم خۆکارییەیە لە زماندا، ئەمەش لەرێگەی زەقکردنەوەوە دەبێت کە پێچەوانەی خۆکارییە لە زماندا.

## ٤-١ پێشینەیەکی کورتی لادان:

لادان وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا یەکێکە لە جۆرەکانی زەقکردنەوە. ئەم زاراوەیە لەبواری زمانەوانیی نوێ و رەخنەی زمانەوانییانە وەرگیراوە و لەرێگەی زمانی ئینگلیزیەوە چۆتە نێو باسەکانی رەخنەی ئەدەبییەوە.[١]

### ١-٤-١- زەقکردنەوە

بونیادگەران زاراوەی زەقکردنەوەیان لەدەروونزانی وەرگرت و لەبری ئاشنایی سڕینەوە خستەیانەروو.( **یوهانس ویلم برتنز: ١٣٨٤/٢٠٠٣: ٦٦**) مێژووی زەقکردنەوە بۆ پێش جەنگی دووەمی جیهانی، قوتابخانەی پراگ و کاریگەریی بۆچوونی فۆرمالیستە رووسەکانەوە دەگەڕێتەوە. ( **میمنت میر صادقی: ١٣٨٥/٢٠٠٤: ١٢**)

شکۆلۆفسکی (Shkhlovesky)، موکارۆفسکی (J.Mukarovesky) و هاڤرانك دوو پرۆسەی خۆکاری و زەقکردنەوە یان لەیەکتر جیاکردەوە و پرۆسەی زەقکردنەوە، بەپرۆسەیەك دەژمێردرێ کە زمانی خۆکار دەگۆڕێت بۆ زمانی ئەدەبی.(کورش صفوی: ١٣٨٢/٢٠٠١: ٣٣) بەو واتایەی کە دەبێتە هۆی داهێنانی دەقێکی ئەدەبی و بەمەش دەقەکە لە دەقێکی ئاسایی جیادەکرێتەوە.

**شەفیعی کەدکەنی** زمانەوان و ئەدیبی ئێرانی زەقکردنەوە دەکات بە دوو گرووپەوە، گروپی موسیقی و گرووپی زمانی.(محمدرضا شفیعی کدکنی: ١٣٨٥/٢٠٠٤: ٧) لای ئەم گرووپی موسیقی کۆمەڵە هۆکارێکە کە دەبنە هۆی جیاکردنەوەی زمانی ئەدەبی و زمانی خۆکار، ئەمەش لە رێگای ئاواز و تەریببوونەوە و ئەمانەش دەبنە هۆی بەدەست هێنانی کێش، سەروا، رەدیف و هاوئاهەنگییە دەنگییەکان.(هەمان سەرچاوە: ٩) زەقکردنەوە لە دوو شێوە خۆی دەنوێنێت، یەکەم بەشێوەی لادان لەو یاسایانەی کە زاڵن بەسەر زمان و ناودەنرێ

---

١- مەبەست ئەو جۆرە رەخنەی ئەدەبییەیە کە پشت بە زمانەوانی دەبەستێت.

لادان و دەبێتە هۆی داهێنانی شیعر و دووەم: زیادکردنی یاسایەك بۆ یاساکانی زمانی خۆکار کە ناونراوە ڕێسازیادکردن کە دەبێتە هۆی داهێنانی هەڵبەست. (G.N.Leech,1969:42-57)

### ١-٤-١-١- ڕێسازیادکردن

ڕێسازیادکردن بە بەکارهێنانی یاسای زیادە بۆ یاساکانی زمانی خۆکار دەژمێردرێت و بەم پێیە لەڕووی چیەتیەوە لە لادان جیادەبێتەوە.(کورش صفوی١٩٩٣/١٣٧٤: ٥٠) نووسەر لێرەدا جگە لەوەی کە پەیڕەوی یاساکانی زمان (سیستمی زمان) دەکات، چەند یاسایەکی تریش دەخاتە سەر یاساکانی زمان. بە واتایەکی تر سیستەمێکی تر، سەرباری سیستەمی زمان خۆی، بۆ زمانەکە زیاد دەکات. بەرهەمی ئەم پرۆسەیەش بریتییە لە تەریببوون. دەشێ بڵێین بۆ یەکەم جار **یاکۆبسن** تەریببوونی خستۆتەروو. هەروەها وای بۆ دەچێ کە پرۆسەی ڕێسازیادکردن تەنها بریتییە لە تەریببوون ئەم تەریببوونەش لەرێگەی دووبارەبوونەوەوە بەرهەم دێت.(هەمان سەرچاوە، ٥٠)

### ١-٤-١-٢- لادان

لادان بریتییە لە لادان لە یاساکانی زمانی خۆکار. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هیچ سنوورێك نەبێت بۆ ئەم لادانە، **لیچ** لەکاتی باسکردنی لادان و ڕێسازیادکردندا سنوورێك بۆ ئەم دوانە دادەنێ. بەبڕوای ئەو لادان تەنها کاتێك دەتوانێ تا ئەو سنوورە بچێتە پێشەوە کە پەیوەندی دروستکردن تێك نەچێ و بەرجەستەکردن شیاوی دەربڕین بێت. (G.N.Leech,1969:31-54)

هێڵێکی زۆر باریك هەڵەی زمانی لە داهێنان جیادەکاتەوە. هەردووکیان بریتین لە لادان لە یاسا و بەزاندنیان، یەکێکیان بە دەست شاعیرەکە خۆیەتی و لە ژێر دەسەڵاتیدایە بۆ مەبەستێك هێناونی (داهێنان) ، ئەوی تریان لە رووی نەزانین و

گوێ نەدان و هەڵەشییەوە پەیدا دەبێ. داهێنان دیاردەیەکی (ئیجابی) پڕ مەبەستە بەڵام هەڵە دیاردەیەکی (سەلبی) کە لە سەر شاعیرەکە دەکەوێ و جیاکردنەوەیان پەیوەندی بەجۆری بەکارهێنان و کەڵك لێوەرگرتنەوە (استثمار)هەیە.(محەمەد مەعروف فەتاح) بەم پێیە هەریەکە لە تێك نەچوونی پەیوەندی دروستکردن و داهێنان مەرجن بۆ ئەوەی لادانەکە بەلادانێکی سەرکەوتوو دابنێین.

دواتر لیچ لادان بەسەر ئەم هەشت جۆرەی خوارەوەدا دابەش دەکات :(G.N.Leech,1969:31-54)

١- لادانی لێکسیکی
٢- لادانی فۆنۆلۆژی
٣- لادانی کاتی
٤- لادانی شێوازی
٥- لادانی واتایی
٦- لادانی رستەسازی
٧- لادانی زاری
٨- لادانی نووسینی

جگە لەم هەشت جۆرە هەندێ لادانی تریش لای نووسەرانی ترەوە دەستنیشان کراون لەوانە:لادانی گوتاری و لادانی ناوەوەیی(سیماداد: ٢٠٠٤/١٣٨٥: ٥٤٠-٥٤٢).

### ٥-١ جۆرەکانی زمانی ئەدەبی:

کەدکەنی جیاوازی لەنێوان شیعر و هەڵبەستدا دەکات و جگە لە هەڵبەستیش ئاماژە بە جۆرێکی تری زمانی ئەدەبی دەکات و ناوی دەنێ (نظام) کە لە رێگەی جوانی ناسییەوە دێتە بەرهەم و بەجۆرێکی جیانەکراوەی شیعری دادەنێ. (محمدرضا شفیعی کدکنی: ٢٠٠٤/١٣٨٥ ٢٣٧-٢٣٩) لیچ یش جیاوازی لە نیوان هەریەکە لە

شیعر و هەڵبەست دا دەکات. بەڵام هەردووکیان راستەوخۆ باس لە جیاوازی نێوان پەخشان و دوو جۆرەکەی تری ئەدەبی (شیعر و هەڵبەست)ناکەن" هەرچی **کرۆمبی** (D.A.Crombie)ی زمانەوانیشە باسی جیاوازی نێوان پەخشان و هەڵبەست دەکات و بۆ جیاکردنەوەی هەڵبەست و پەخشان سود لە ئامرازە فۆنەتیکەیەکان وەردەگرێت. وای بۆدەچێ کە لە هەڵبەستدا جۆرێك لە رێسابەندیی برگەکان هەیە، بەڵام لە پەخشاندا بەیەکەوەهاتنی برگەکان شوێنکەوتووی یاسای ناوبراو نین. بەڵام باس لە جیاوازی نێوان پەخشانی ئەدەبی و پەخشانی نائەدەبی ناکات.(کورش صفوی: ١٣٧٤/١٩٩٣: ٥٣) هەرچی **حەق شناسە** جگە لە باسکردنی سێ جۆرە ئەدەبییەکە باس لە جیاوازی نێوان پەخشانی ئەدەبی و پەخشانی نائەدەبیش دەکات و لەرِیگەی هێنانەوەی چەند نموونەیەکەوە جیاوازیەکانیان روون دەکاتەوە.

**حەق شناس** جۆرەکانی ئەدەبیات بەسەر سێ جۆردا دابەش دەکات، واتە شیعر، هەڵبەست و پەخشان. پێی وایە کە شیعر بە ناوەوەی زمانەوە بەندە و هەڵبەست بە دەرەوەی زمانەوە و دەڵێت: (( . . . دەتوانین بڵێین کە هەڵبەست بەندە بە دەرەوەی زمان واتە (شێوە) و شیعر بەندە بە ناوەوەی زمان واتە (ناوەرِۆك). مەبەستم لە دەرەوەی زمان فۆرِمی زمانە و هەمو رۆنانە ناواتاییەکانییەتی" و ناوەوەی زمانیش هەر ئەوەیە کە بەگشتی لە ئاستی واتاسازیدا لێی دەکۆڵرێتەوە هەرچەندە کە لە ئاستەکانی تریش بەرچاو دەکەوێت. . . . زمانی شیعر بە پێچەوانەوە، هەمووی لە واتا دەکەوێتەوە. )) (علی محمد حق شناس: ١٣٧٤/١٩٩٣، ١٠٩) دوابەدوای هەر یەکە لە هونەرەکانی رەوانبێژی کە دەبنە هۆی داهێنانی هەڵبەست یا شیعر لێك جیا دەکاتەوە، ئەمیش بە پێی ئەوەی کە ئایا تەنها بەندە بە فۆرِم یا بە واتاشەوە بەندە. هەر یەکە لە کێش، سەروا، تەرجیع بەند ، رەگەزدۆزی و لەف و نەشر دەبنە هۆی داهێنانی هەڵبەست و هەریەکە لە ( لێکچون، خواستن، درکە و هەموو جۆرەکانی خوازە) دەبنە هۆی داهێنانی شیعر. لەبارەی پەخشانی ئەدەبیشەوە دەڵێ: لە پەخشانی ئەدەبیدا، جۆرەکانی زمان تێکەڵ بەیەك دەکرێن. مەبەستیشی لە

جۆرەکانی زمان  زیاتر (Registet) ە کە دەشێت تا سنووری زاریش بچێتە پێشەوە و هەموو ئەو شێوە یا جۆرە جیاوازانە  دەگرێتەوە کە لە زماندا بەرچاودەکەون وەکو جۆری وانەوتنەوە و جۆری قسەکردنی نێو خێزان، جۆری بەرگریکردن لە دادگادا و یا. . . . هەرچی پەخشانی نائەدەبییە (پەخشانی سەروادار) تیایدا نە دەبێت خەریکی ناوەوەی زمان و نە خەریکی دەرەوەی زمان دەبێت. (علی محمد حق شناس: ١٩٩٣/١٣٧٤، ١١٠-١١١) بە واتایەکی تر نە سوود لە ڕێسازیادکردن و نە سوود لە لادان وەردەگرێت. هەروەها جۆرەکانی ئەدەبیات لە سێگۆشەیەکی لەم جۆرەدا دەخاتە ڕوو:

هێلکاریی ژمارە (٣) سێگۆشەی جۆرەکانی ئەدەبیات

وەك لە وێنەکەدا دەردەکەوێ شیعر دەکەوێتە سەرێکی سێگۆشەکە و هەر یەکە لە هەڵبەست و پەخشانیش دەکەونە سەرەکانی تری سێگۆشەکە و پێی وایە دەتوانرێ هەردەقێکی ئەدەبی کە بمانەوێ لەم سێگۆشەیەدا شوێنی بکەینەوە.(هەمان سەرچاوە،١١٣)

## ١-٦- جۆرەكانی زمانی ئەدەبیی كوردی:

ئەگەر هەر یەكە لە (شیعر، هەڵبەست و پەخشان) وەك سێ جۆر وەربگرین ئەوا لە زمانی كوردیدا كۆمەڵێك جۆری ئەدەبیمان هەن. لێرەدا چەند نموونەیەك لە دەقەكانی ئەدەبی كوردی دێنینەوە و لە رێگەی ئەم نموونانەوە هەوڵ دەدەین جۆرەكانی ئەدەبی كوردی دیاری بكەین. ئەگەر سەیری ئەم نموونەیە بكەین:

### ١- پەخشانی نائەدەبی

((لە سەرەتای نووسینی هەموو فەرهەنگێكدا كێشەی هەڵبژاردنی وشە دێتە پێشەوە. بنچینەی هەڵبژاردنی وشە پەیوەندە بە جۆر و بابەت و مەبەستی فەرهەنگەوە. تاكو ئێستا كێشەی هەڵبژاردنی وشە بۆ فەرهەنگ لە هیچ وڵاتێكی جیهاندا شێوازێكی زانستی تەواوی وەرنەگرتووە و هەندێ رووی ئەم مەسەلەیە هەر بە ئاڵۆزی ماوەتەوە. . . )) (عەلائەددین سەجادی، ٢٠٠٠: ٣٢٠)

دەبینین، نە خۆی بە ناوەڕۆك (واتا)وە خەریك كردووە و نە بە شێوەوە خەریك بووە، بەڵكو مەبەست تیایدا تەنها گەیاندنی واتا بووە. بۆیە دەتوانین بە دەقێكی نائەدەبی بزانین و نموونەی ئەم دەقە لە كتێبەكانی مێژوو، فەلسەفە، كیمیا، گەردووناسی و . . . دا گەلێ زۆرە.

كەچی لەم نموونەیەدا:

### ٢- پەخشانی ئەدەبی

((بە ئەدەبەوە گوتم:

- هەرگیز ناتوانم داستانەكانت لە بیركەم. حوسێن تا ئەبەد لە ناخی مندا خوێنی لێ دەڕژێ، پێش تۆ من وام دەزانی بیابان تەنها حوشتر دەلاوێنێتەوە، تەنها بەدویەك لەوپەڕی غەمباریدا بەرانبەر ئاوابوونی خۆر شمشاڵ لێدەدات، لای تۆ بیابانم

ناسی، حوشترێك، ئەوەی تۆ ناوت نا، حوشتری زەرد، هەزار ساڵە بەخۆی و تەرمێکەوە ون بووە، هەرگیز وێنەی ئەو پیاوەم لەبیرناچێتەوە کە چوو ئاو بێنێ، لە وەختی گەڕانەوەدا چل و دوو تیریان لێدا و ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی کە نەکەوێ و ئاوەکە بگەیەنێتە حوسێن.

ئەو گوتی:

- بێوەفا بڵێ حەزرەتی حوسێن

. . .

ئەو لەوپەڕی حوزنیدا دەڵێت:

- ئەو کۆترانە رۆحی نازداری حەزرەتی عەلی چوکەڵەن، ئەو فریشتەیەی خودا، ئەو فریشتەیەی دنیا بەراستی چاوەڕێی بوو.

ئەو جارە کەمێك وشك و رەق گوتم:

- ئەی بەندەی حوسێن، من ئەمڕۆ ناتوانم نە چیرۆکەکەی تۆ و نە چیرۆکی فریشتەکانی خودا بگێڕمەوە، تەنها و تەنها کارێکتەرێکم دەوێت، بەدوای کەسێکدا دەگەڕێم، لە چیرۆکێکدا کارەکانم بۆ راپەڕێنی.)) (جەبار جەمال غەریب،٢٠٠٧: ١٦)

نووسەر سوودی زیاتر لە یەك شێواز وەرگرتووە و بەمەش دەقەکەی خۆی لەڕێگەی تێکەڵکردنی شێوازەکانەوە بەرجەستەکردووە.

بەڵام لەم نموونەیەدا:

### ٣- پەخشانە شیعر

(( دەبا ئەو زەمهەریرە بیڕێتەوە، دەبا ئەو بایە ریش سیخە سۆڵە بڕەوێتەوە، سەید وەك لەسەر باڵی گەردەلوول بێ دەهەژا و ئەو قسانەی بەنێو هەناسەکانی گەردەلوولدا لێی بەردەبۆوە، دەیگوت‌تێمە لەبەر نێو و یادی ژن شارمان چۆڵ کرد و لەبەر بۆنی ژن لە ئاو رەوینەوە و هەڵمەمان بەنەعلەت کرد، لەبەر نیگای ژن بریسکەی چاو و رەونەقی پێست و نەرمیی لەش و هەوەسمان کوشت و ئاوێنەمان شکاند. )) (جەبار جەمال غەریب، ٢٠٠٠: ٣٢)

نووسەر بەدەر لەوەی کە سوودی لە لادانی شێوازی وەرگرتووە، هەندێ لادانی تریشی (لادانی واتایی) تێدایە کە دەقەکە زیاتر لە شیعر نزیك دەکاتەوە. وەکو (ئەو بایە ریش سیخە سۆڵە)، ( باڵی گەردەلوول)، ( ئەو قسانەی بەنێو هەناسەکانی گەردەلوولدا لێی بەردەبۆوە) و ( بریسکەی چاو و رەونەقی پێست و نەرمیی لەش و هەوەسمان کوشت). لەیەکەمیاندا ریشی بە بایەکەبەخشیوە و بەمەش سیفەتی مرۆڤی داوەتە (با)یەکە و بەمرۆڤکردن دروست بووە. لەدووەمیاندا سیفەتی باڵندەی داوەتە گەردەلوول و باڵی پێ بەخشیوە و بەمەش بەئاژەڵکردن رووی داوە. لەسێیەمیاندا سیفەتی گیانلەبەری داوەتە (گەردەلوول) و هەناسەی پێ بەخشیوە. کەچی لە چوارەمیاندا سیفەتی زیندویی بەخشیوە بە هەریەکە لە (بریسکەی چاو، رەونەقی پێست، نەرمی لەش).[2]

هەرچی ئەم نموونەیەیە:

## ٤- پەخشانە هەڵبەست

((ئەی موسوڵمانینە بزانن ئەم مانگە مانگی مەولوودە، مانگێکی زۆر موبارەك و مەحموودە، ئەییامێکی گەورە و عەزیمە، رۆژگارێکی شەریف و کەریمە، بەواستەی ئەم مانگەوە بووین بە مؤمن و موسوڵمان، بەواستەی ئەم مانگەوە زاهر بوو نووری ئیمان. چوار یاری پێغەمبەر (ص) ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی خوایان لێ رازی بێ مەدحی مانگەیان زۆر کردووە، وەهەمیشە بە تەعزیم و گەورەیان نێو بردووە. . . )) (عەلائەددین سەجادی، ٢٠٠٠: ٣٤)

جیاوازی لەگەڵ پەخشانەکانی پێشوو لەوەدایە کە ئەم پەخشانە سوودی لە سەجع وەرگرتووە، کە یەکێکە لە کەرەسەکانی پێکهێنانی هەڵبەست(کورش صفوی،١٩٩٣: ٢٩١) ، بەمەش بەپێچەوانەی دەقەکەی پێشوو زیاتر لە هەڵبەست نزیك بۆتەوە نەك لە شیعر.

ئەم دەقەش:

---

٢- لەبەشی داهاتوودا باس لەهەریەکە لە (بەمرۆڤکردن، بەئاژەڵکردن و چەند زاراوەیەکی تر) دەکەین.

**٥- هەڵبەست**

(( (رَأس): سەرە. (عَيْن): چاوە

(بدَنَ): قالب (اِسْم): ناوە

(أنف): لووتە (حاجِب): برۆ

(فَخِذ): رانە. (رُكْبَة): ئەژنۆ)) (شێخ مەعروفی نۆدێ؟: )

هەڵبەستێکە کە لە بنەڕەتدا پەخشانێکی نائەدەبییە و لە ڕێگەی سوود وەرگرتن لە کەرەسەی داهێنانی هەڵبەستەوە (وەك بەکارهێنانی: کێش، سەروا، ڕەگەزدۆزی و. . . هتد) بۆتە دەقێکی ئەدەبی.

کەچی ئەم دەقە:

**٦- هەڵبەستە شیعر**

((بەحری (تقارب)ئەجزاکەی هەشتن

نەغمەیان نەغمەی ئەهلی بەهەشتن

(فعولن)تەکرار هەتا چوارە

بۆ هەر مەصرەعێ حەدیان دیارە

دوو (عروض)ی هەن یەکەمیان ساغە

چوار (ضرب)ی هەیە وێنەی گوڵباغە)) (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ١٩٩١: ٨٨)

سەرەڕای ئەوەی کە سوودی لە کەرەسەکانی داهێنانی هەڵبەست وەرگرتووە" سوودی لە کەرەسەکانی داهێنانی شیعریش وەرگرتووە"بەڵام ڕێژەی بەکارهێنانی کەرەسەکانی داهێنانی هەڵبەست زیاترە لە کەرەسەکانی داهێنانی شیعر.

لەم دەقەدا

**٧- شیعرە هەڵبەست**

((خەطات فەرموو کە خۆشە چین و ماچین
کە ناچین، لێرە خۆشە چینی ماچین
برۆت هەر چین و پەرچەم چین لەسەر چین
ئەمەندە چینە، قوربان، پێم بڵێ چین؟)) (نالی،١٩٧٨: ٣٤٥-٣٤٦)

بەپێچەوانەی دەقەکەی پێشوو شاعیر لەپاڵ سوود وەرگرتن لە کەرەسەکانی داهێنانی شیعر سوودیشی لە کەرەسەکانی داهێنانی هەڵبەست وەرگرتووە.

لەرێگەی خستنەرووی ئەم چەند دەقە ئەدەبییە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەدەبی کوردی ژمارەیەکی زۆر جۆری ئەدەبی هەیە. ئەمیش بەپێی دەستنیشانکردنی ئەوەی کە ئایە سوودی لە کەرەسەکانی داهێنانی کام لەسێ جۆرە ئەدەبییەکە و رێژەی بەکارهێنانیان دەتوانین جۆری دەقەکە دیاری بکەین.

## ١-٢- لادانی لێکسیکی

بەگوێرەی پێوانە و بە لادان لە ڕێساکانی ڕۆنانی وشەی زمانی خۆکار، وشەیەکی تازە زیاد دەکات و بەکاری دێنێت. (کورش صفوی١٣٧٤/١٩٩٣: ٤٦) یاخود شاعیر بە سوود وەرگرتن لەو وشەسازیەی لە زماندا هەیە، و بە گشتاندنی، و بەلادان لە سنووردارێتیی بەکارهێنانیدا وشەی نوێ درووست دەکات.(منصور ستودە١٣٨٥/٢٠٠٤: ١٣) ئەم جۆرە لادانە، بەپێچەوانەی لادانی وشەسازی ، لادان نییە لە یاسا وشەسازییەکانی زمان، بەڵکو بەپێی یاسا وشەسازیەکانی زمان و بە لادان لە سنووردارێتی ئەم یاسایانە شاعیر هەوڵ دەدات لێکسیکێك بۆ زمانەکەی خۆی زیاد بکات. ئەم لادانە زمانییە بۆ مەبەستی جیاجیا بەکاردێت. **محەمەد مەعروف فەتاح** وای بۆ دەچێ کە ((هەندێ جار شاعیر بۆئەوەی لە درێژبڕی دەرچێت یان بۆ پاراستنی وزە و لکاندنێکی توندوتۆڵ یان نەبوونی هەندێ کەرەسەی ئامادە لە زمانەکەدا خۆی وشە دادەتاشێ )) (محەمەد مەعروف فەتاح) هەروەها **لیچ** لەو بڕوایەدایە کە داهێنانی وشە یاسای لێکسیکی تێك نادات بەڵکو دەبێتە هۆی دەوڵەمەند بوونی زمان.(مریم خلیلی جهانتیغ١٣٨٢/٢٠٠١: ١٧٦) ئەم جۆرە لادانە خۆی دابەشی دوو جۆر دەبێ: وشە داهێنان(G.N.Leech,1969:31-54) ئاماژە بەو دیاردەیەی بواری وشەسازی دەکات کە بەهۆی ئەوەوە قسەکەر وشەیەك دروست دەکات کە پێشتر لە دەقی ئەو زمانەدا نەبووە. دووەمیان گۆڕینی ئەرکی (functional conversion) پرۆسەی گۆڕینی کاتیگۆریەکی ڕێزمانیی وشەیەکە بۆ کاتیگۆریی ڕێزمانیی وشەیەکی تر. لەم دیاردەیەدا نەك تەنها پەیوەندی واتایی نێوان وشەکان تێکەڵ دەکرێن، بەڵکو ئەو پەیوەندییانەشی کە پێویستیان بەو هاونشینییە باوەی وشە هەیە کە لە پانتایی پەیوەندیی ڕێزمانییدا واتادارن، دەگۆڕێت.(سیماداد ١٣٨٥/٢٠٠٤: ٥٤١)

### ٢-١-١- داڕێژراو[1]

ئەی تەلەفی گفتو گۆ، جامیعی کیذب و درۆ
واعیظییە ئیشی تۆ، *عاشقی* یە کاری من (نالی،١٩٧٨: ٣٣٦)

لێرەدا نالی بەپێی یاسای مۆڕفۆلۆژیی کوردیی(ناو+ی) و بە لادان لە سنوردارێتی هەمان یاسا وشەی (عاشقی) ی دروست کردووە.

### ٢-١-٢- لێکدراو:

دائیم لەدووتە مێگەلی ژن، *نێرگەل* ی پیاو
بەم ریشەوە لەپێشەوە بوویی بە سەرگەلە(نالی،١٩٧٨: ٤٦٨)

لێرەدا شاعیر بەپێی یاسای مۆڕفۆلۆژیی کوردیی(ناو+پاشگری گەل) و بە لادان لە سنوردارێتی یاساکە وشەی (نێرگەل) ی دروست کردووە.

## ٢-٢- لادانی واتایی

لادانی واتایی بەواتای لادان لەو پێوەرانە دێت کە بەیەکەوەهاتنی لێکسیکەکان دیاری دەکەن، یا لادان لەو سیما واتاییانەی کە زاڵن بەسەر بەکارهێنانی لێکسیك لە زمانی خۆکاردا، واتە ئەرکی گەڕانەوەیی زمان. (فرزان سجودی،١٩٩٧:) لادانی واتایی واتای پێچەوانەی درووستی واتاییش دەگەیەنێ. دەتوانین بڵێین دوو مەرج بۆ دروستی واتایی هەیە ئەوانیش دروستی لە رووی لێکدانی رێزمانی و لەباری لە رووی واتاوە.(جولیا اس..فالك،١٩٩٨/١٣٧٧: ٣٦٧) سەفەوی بەپێی ئەو دوو پەیوەندییەی کە **یاکۆبسن** ناویان دەنێ پەیوەندی هەڵبژاردن و لێکدان، و سۆسێر پێیان دەڵێ هاونشینی و بیرخستنەوە، لادانی واتایی دابەش دەکات:

---

[1] - لادنی لێکسیکیی سادە نییە، چونکە شاعیر لەم لادانەدا بەپێوانە لەسەر ئەو وشانەی کە لە ...انەکەیدا هەن، وشەی تازە دادەهێنێ.

**هێلکاریی ژمارە (٤)**
**جۆرەکانی لادانی واتایی لای کۆرشی سەفەوی**

بەڵام د. عەبدولواحید بە سوود وەرگرتن لە بنەماکانی هاریکاری نێوان قسەکەر و گوێگر( ی گرایس) کە ئەمانەن
لادانی واتایی بەسەر چوار جۆردا دابەش دەکات:
١- چەندێتی
٢- چۆنییێتی
٣- گونجان
٤- شێواز (د. عبدالواحد مشیر دزەیی، ٢٠٠٧)
هەرچی سجودی یە دابەشکردنێکی تر بۆ جۆرەکانی لادانی واتایی دەکات. ئەمەش بەجەخت کردنەوە لەسەر واتاسازی، بەئاگابوون لە یاساکانی بەیەکەوەهاتنی لێکسیك. توانیویەتی دابەشکردنێکی گشتگیرتر و لە هەمان کات تێروتەسەلتر بۆ لادانە واتاییەکان بکات.(فرزان سجودی١٣٧٩/١٩٩٨: ٢٢) سەرەتا لادانە واتاییەکانی بەسەر دوو جۆردا دابەش کردووە کە بەبەرجەستەکردن

و بەئەبستڕاکتکردنن. بەبەرجەستەکردنیش سێ جۆری هەیە، بەزیندەوەرکردن، بەرەوانکردن و بەتەنکردن. بەزیندەوەرکردنیش دوو جۆری هەیە بەرووەککردن و بەگیاندارکردن. بەگیاندارکردنیش دوو جۆری هەیە کە بەمرۆڤکردن و بەئاژەڵکردنە. دەتوانین ئەم دابەشکردنەی سجودی لە هێلکارییەکی لەم جۆرەدا روون بکەینەوە:

هێڵکاریی ژمارە (٥)
جۆرەکانی لادانی واتایی لای فەرزان سجودی

### ٢-٢-١- بەبەرجەستەکردن

پێدانی سیمای واتایی [+بەرهەست]ە بە [+ئەبستڕاکت] (فرزان سجودی: ١٣٧٨/١٩٩٧).

### ٢-١-١- بەزیندەوەرکردن (animalnees)

پێدانی سیمای [+ زیندەوەر]ە بەوەی کە لە زمانی گەڕانەوەییدا (- زیندەوەر)ە. (فرزان سجودی: ١٣٧٨/١٩٩٧).

بەپێی ئەم تیۆرە زمانەوانییە وەنەبێ لادانی زمانی (واتایی، ڕێزمانی و...) تەنها لە شیعری تازەدا هەبێ بەڵکو لە دەقە ئەدەبییە کۆنەکانیشدا زۆر زەق بەرچاو دەکەون.

### ٢-١-١-١- بەرووەککردن

ئەم جۆرە لادانە بریتییە لە پێدانی تایبەتمەندییەکانی ڕووەك بەوەی کە لە بەکارهێنانی گەڕانەوەییدا ناڕووەکیە. بە دەربڕینێکی تر پێدانی سیمای (+ڕووەك) بە [- ڕووەك]. (فرزان سجودی: ١٣٧٨/١٩٩٧)

لێوی تۆ ئاوی بەقا من خضرم

فەیضی تۆ رەحمەت و، *__من سەوزەگیا__* (نالی،١٩٧٨: ١٢٥)

لێرەدا شاعیر جێناوی کەسی سەربەخۆی (من) ،کە مرۆڤە، چواندووە بە سەوزەگا بەمەش لادانی واتایی(بەرووەککردن) ی ئەنجام داوە.

### ٢-٢-١-١-٢- بەگیاندارکردن

گیاندار ئەو زیندەوەرانە دەگرێتەوە کە لە زمانی خۆکاردا خاوەنی سیمای واتایی [+زیندەوەر] و [-ڕووەك]ن. بەگیاندارکردنیش بریتییە لە پێدانی سیمای واتایی

[+گیاندار] بەوەی کە بەپێی یاسای بەیەکەوەهاتنی لێکسیکەکان لە ئەرکی گەڕانەوەییدا دەبێت سیمای [-گیاندار]ی هەبێت. (فرزان سجودی:١٩٩٧/١٣٧٨)

**٢-٢-١-١-٢-١- بەمرۆڤکردن (personification)**

بریتییە لە پێدانی تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ بە شتە نازیندووەکان.(هەمان سەرچاوە: ) یان دروستتر بڵێین پێدانی تایبەتمەندییەکانی مرۆڤە بە نامرۆڤ.

فەرشی کەففی بەری پێتە ***نەرگس***
***سەری داخستووە*** وەك چاوی حەیا (نالی،١٩٧٨: ١٢٦)

لەم دێرە شیعرەدا شاعیر کاری (سەرداخستن) ی داوەتە پاڵ نەرگسی کە یەکێکە لەو سیمایانەی کە تایبەتە بە مرۆڤ و بەمەش بەمرڤکردنی ئەنجام داوە.

**٢-٢-١-١-٢-٢- بەئاژەڵکردن**

هەرکاتێك وشەیەك بە سیمای [- ئاژەڵ] لە شوێنی وشەیەك دابنرێت کە بە پێی یاسای بەیەکەوەهاتنی لێکسیکی دەبێت سیمای [+ئاژەڵ]ی هەبێت، بەئاژەڵکردن رووی داوە. (فرزان سجودی: ١٩٩٧/١٣٧٨)

***ئەسپی نەفەست*** دێت و دەچێ، گەرمە عەنانی
ئەی مەستی ریاضە ت هەڵەاهوشیاری جڵەو بە (نالی،١٩٧٨: ٣٩٣)

لەم دێرەدا شاعیر نەفەسی بە ئەسپ چواندووە، بەمەش مامەڵەی ئاژەڵی لەگەڵ نەفەسدا کردووە.

**٢-٢-١-٢- بەرەوانکردن**

بریتییە لە پێدانی سیمای واتایی [+رەوان] بەو وشانەی کە سیمای واتایی [رەوان]یان هەیە. (فرزان سجودی:١٩٩٧/١٣٧٨)

که خاکی، خاکی دامەن بە، وەگەر نە، تۆزی بەربادی
*که ئاوی*، ئاوی گەوهەر بە، وەگەرنە، بلقی سەر ئاوی(نالی،١٩٧٨: ٦٨٣)
لەم دێرە شیعرەدا شاعیر روو لە یەکێك دەکات و مامەڵەی ئاوی لە گەڵ دەکات و بەمەش سیمای جیاکەرەوەی واتایی [+رەوان]ی پێ دەدات.

**٢-٢-١-٣- بەتەنکردن**

هەر کاتێك کە وشەیەك بە سیمای [- تەن] لەشوێنی وشەیەك دابنرێت کە لە بەکارهێنانی گەڕانەوەییدا سیمای [+ تەن] ی هەیە ئەوا بە بەتەنکردن رووی داوە. (فرزان سجودی:١٩٩٧/١٣٧٨)

*سەر بەردەبازی رێتە*، تەن تەختە بەندی جێتە
دڵ مەیلی خاکی پێتە، رۆحماڵی خۆتە بیبە (نالی،١٩٧٨: ٣٩٥)
لێرەدا سە بە بەردەباز، کە سیمای جیاکەرەوەی [+تەن] ی هەیە، چوێنراوە بەمەش بەتەنکردن رووی داوە.

**٢-٢-٢- بەئەبستراکتکردن**

هەر کاتێك کە وشەیەك بە سیمای [- بەرهەست] لەشوێنی وشەیەك دابنێت کە لەبەکارهێنانی گەڕانەوەییدا سیمای [+ بەرهەست] ی هەیە ئەوا ئەبستراکتکردن رووی داوە. (فرزان سجودی:١٩٩٧/١٣٧٨) یاخود پێدانی سیمای واتایی [+ئەبستراکت] بەو وشەیەی کە لە سیستەمی واتایی زمان لە ئەرکی گەڕانەوەییدا سیمای واتایی [+بەرهەست]ی هەیە. (هەمان سەرچاوە) یان پێدانی سیمای [+ئەبستراکت]ە بە وشەیەك کە لە بەکارهێنانی گەڕانەوەییەکەیدا [- ئەبستراکت]ە و یا بەدەربڕینێکی تر بەرهەستە. .(هەمان سەرچاوە)

خاڵت چییە؟دانەی گەنمی جەننەتی رووتە

***چاوت*** چییە؟***فیتنەی*** حەرەمی قیبلەیی ئەبرۆ (نالی،١٩٧٨: ٣٨٧)

لەم دێرەدا چاو ، کە لە زمانی خۆکاردا سیمای جیاکەرەوەی [+بەرهەست] ی هەیە، سیمای جیاکەرەوەی [+ئەبستراکت] ی پێدراوە.

**٢-٢-٣- دژواتایی یا پاڕادۆکس**

دژواتا یا پاڕادۆکس بریتییە لە بەیەکەوەهاتنی دوو وشە کە لە بەکارهێنانی خۆکاردا بە شێوەی دژ یا دژیەك بەکاردێن.( منصور ستوده١٣٨٥/٢٠٠٤: ٣٦) یاخود(( گوتەیەکە کە بە رواڵەت دژیەك یا بێبایەخە (مهمل)، بۆیە وا لە تاکەکەس دەکات کە بەدوای واتایەکی قووڵتردا بگەڕێ. )) (ابراهیم چنگی،٢٠٠٣: ٣٣٣)

هەرچەندە کە ***عومری خضر و جامی جەمت بوو***

چونکە ئەمەلت زۆرە، چ ***عومرێکی کەمت بوو***(نالی،١٩٧٨: ٣٦٧)

لێرەدا شاعیر بە هێنانەوەی دوو رستە، کە لە یەکەمیاندا تەمەنێکی زۆر بە کەسی بەرامبەری دەدات و لە دووەمیاندا پێی دەڵێ تەمەنێکی کەمت بوو، پاڕادۆکس یا دژواتایی درووست کردووە.

**٢-٣- لادانی دەنگی**

**سەفەوی** پێی وایە کە لادانی دەنگیی کاتێك روودەدات کە شاعیر لە یاسا دەنگییەکان لابدات و فۆڕمێك بەکاربێنێت کە لە رووی دەنگییەوە لەزمانی خۆکاردا باونیە. (کورش صفوی١٣٧٤/١٩٩٣: ٤٧) هەریەکە لە **سەفەوی** و **سجودی** پێیان وایە کە لادانی دەنگیی زۆربەی کات پێویستیەکن بۆ پاراستنی کێشی شیعر. (فرزان سجودی١٣٧٩/١٩٩٨: ٢١)

مەحەرە ***هاوییەیی*** هەولی فیراق
دەستی من دامەنی تو رۆژی فیراق (نالی،١٩٧٨: ١٢٦)
لێرەدا شاعیر بە زیاد کردنی دەنگی (ی) دوای (ی) ی خستنەسەری دوای وشەی (هاوییە) لە زمانی خۆکارلای داوە و ئەمەش تەنها بۆ پاراستنی کێشی شیعرەکەیە.

**٢-٤- لادانی رێزمانی**

لادانە لەپەیوەندییە رێزمانییەکانی رستە. (سیماداد١٣٨٥/٢٠٠٤: ٥٤٠) ئەمیش دوو جۆری هەیە: لادانی رستەسازی و لادانی وشەسازی.

**٢-١-٤-١- لادانی رستەسازی**

شاعیر هەوڵ دەدات لە رێگەی گۆڕینی ریزبەندی کەرسەکانی رستەی زمانی خۆکار لە زمانی خۆکار لابدات و بەمەش لادانی رستەسازی روودەدات. سەفەویش وای بۆ دەچێ کە شاعیر دەتوانێت لەشیعری خۆیدا بە جێگۆڕکێی توخمە پێکهێنەرەکانی رستە لە یاسا رستەسازییەکانی زمانی خۆکار لابدات و زمانی خۆی لە زمانی خۆکار جیابکاتەوە. (کورش صفوی١٣٧٤/١٩٩٣: ٤٦) جگە لەوەش پێی وایە کە دەشێ بڵێین لە زۆربەی شوێنەکاندا رازاندنەوەی لێکسیك وەکو ئامرازێك بۆ دەست گەیشتن بە هەڵبەست بەکاردێت. (هەمان سەرچاوە: ١٣٨) بەبڕوای سجودیش ئەم بابەتە لە زمانی ئەدەبیدا زیاتر وەکو پێویستی کێش بەکاردێت. ( منصور ستودە١٣٨٥/٢٠٠٤: ٤٩) بەمەش دەبێتە یەکێك لە پێداویستیەکانی هەڵبەست. لە زمانی کوردیشدا زۆربەی کات ئەم لادانە وەکو پێویستیەك بۆ پاراستنی کێش بەکاردێت.

عەجەب ئەستێرە شەو هەڵدێ لەتاوی خوسرەوی خاوەر
***بەرووی تۆم دیدە هەڵنایێ*** شەو و رۆژ گەرچی بێدارم (نالی،١٩٧٨: ٢٧٢)
شاعیر لەم دێرە شیعرەدا شوێنگۆڕکێی بە کەرەسەکانی رستە کردووە لەبری ئەوەی کە بڵێ (بەرووی تۆ دیدەم هەڵنایێ)، دەڵێ(بەرووی تۆم دیدە هەڵنایێ)،

بەواتایەکی تر شوێنی جێناوی لکاوی (م) کە لە بەکاهێنانە خۆکارەکەی زماندا دوای وشەی (دیدە)یە گواستویەتییەوە بۆ دوای جێناوی کەسی سەربەخۆی (تۆ).لێرەشدا بە مەبەستی پاراستنی کێش ئەم کارەی کردووە.

**٢-١-٤-٢- لادانی وشەسازی**

ئەم لادانە گەردانی ئەو مۆرفیمانەی کە لەدەرەوەی ئاسایی زمانن دەگرێتەوە.(سیماداد ١٣٨٥/٢٠٠٤: ٥٤٢) لێرەدا شاعیر هەوڵ دەدات لەرێگەی لادان لە یاسا وشەسازیەکان زمانی خۆی بەرجەستە بکات بەمەش لادانی وشەسازی روودەدات.

موساوی وەك یەك و لولن لە هەر دوو لاوە *__زولفەینی__*

نموونەی عەکسی حەرفی (میم) و (نون) و (واو)ە زولفەینی (نالی،١٩٧٨: ٦٧٤)

لەم دێرەدا بە سوود وەرگرتن لە وشەی زمانی کوردی و وشەسازیی زمانی عەرەبی وشەی (زولفەین) ی دروستکردووە و بەمەش لە وشەسازیی زمانی کوردی لای داوە.

**٢-٥- لادانی کاتی**

بریتییە لە سوود وەرگرتن لە وشە و زاراوەکانی ئاخاوتنی رۆژانەی سەردەمێك کە نەماوە.(عربعلی رضایی١٣٨٤/٢٠٠٣: ١٧) بریتییە لەوەی کە شاعیر یا نووسەر لە بەرهەمی خۆیدا سوود لە وشە کۆچکردوو و ستراکچەرە رێزمانییە کۆنەکان وەربگرێت کەوا ئێستا لە زماندا بەکارنایەن. لیچ پێی وایە کە لادانی کاتی بریتییە لە بەردەوامیی ژیانی زمانی رابردوو لەدوتوێی زمانی ئەمڕۆدا.(مهیار علوی مقدم١٣٨٣/٢٠٠٢: ١١١) هەروەها دەڵێ شاعیر دەتوانێ هەم سوود لە زمانی هاوچەرخان و هەم لە زمانی پێشینان وەربگرێت. (N.Leech,1969:51) ئەمیش دوو جۆری هەیە کە بریتین لە لادانی کاتیی لێکسیکی و لادانی کاتیی رستەسازی.

### ٢-١-٥-١- لادانی کاتیی لێکسیکی

شاعیر سوود لە وشە کۆچکردوو یا گۆکردنە کۆنەکانی تری وشەکان وەردەگرێت.

### ٢-١-٥-٢- لادانی کاتیی رستەسازی

لە لادانی کاتیی رستەسازیدا شاعیر دەچێتە سەر شوێنگۆڕکێی بەشی لە رستە یا لەبری دانانی رۆنانێکی وەکو نزا بۆ رۆنانێکی تری وەکو فەرماندان. (سیماداد ١٣٨٥/٢٠٠٤: ٧٠-٧١) لادانی کاتیی رستەسازی بە واتای هێنانی ئەو وشە یا رۆنانە رستەسازیانەی پەیوەست بوون بە رابردووی زمانەوە و ئێستا ئیدی لە زمانی ستاندەرد دا سوود لەم وشە یا رۆنانە رستەسازیانە وەرناگیرێ.(**محسن نورپیشە قدیمی١٣٨٤/٢٠٠٣: ٨٨**) هەر کاتێك کە شاعیر یا نووسەر لە شیعری خۆیدا سوودی وەرگرت لەو رۆنانە رستەسازییەکانی پێشینان کە ئیدی مردوون وسوودیان لێ وەرناگیرێ، لادانی کاتیی رستەسازی رووی داوە، بەدەربڕینێکی تر ئەم پرۆسەیە بریتییە لە سوود وەرگرتن لە رۆنانە رێزمانییەکانی رابردووان کە لە بەکارهێنانی زمانی خۆکاردا سوودی لێ وەرناگیرێ.(منصور ستودە١٣٨٥/٢٠٠٤: ٢٤٤).

### ٢-٦- لادانی شێوازی

ئەگەر شاعیر لە زمانی نووسینەوە بۆ ئاوازی ئاخاوتن لابدات، جۆرە ئاشنایی سڕینەوەیەك لە دەقی شیعر دەخرێتە روو. (**محسن نورپیشە قدیمی١٣٨٤/٢٠٠٣: ٩٠**) لادانی شێوازی کاتێك روودەدات کە شاعیر بە بەکارهێنانی فرەشێوازی لە شیعردا لە شێوەی نووسراو لابدات. (N.Leech,1969:51-52) لێرەدا شاعیر هەوڵ دەدات لەرێگەی بەکارهێنانی شێوازی ئاخاوتن لەبری شێوەی نووسین لەشیعرەکەیدا لە زمانی خۆکار لابدات و زمانەکەی بەرجەستەبکات و لە زمانی خۆکار جیابکاتەوە.

## ٢-٧- لادانی زاری

لیچ پێی وایە کە لە هەندێ شوێندا شاعیر ڕۆنانگەلێك لە زارێکدا کە لە زمانی خۆکاردا نین دێنێتە نێو شیعر. (N.Leech,1969:) شاعیر هەندێ جار هەوڵ دەدات سوود لە زارەکانی تر وەربگرێت و ڕۆنانەکانی ئەو زارە لەنێو شیعرەکەی خۆی بەکاربێنێت و بەمەش دەقەکەی بەرجەستە دەبێت و بەمەش دەگوترێ لادانی زاری.

ناری سینەم گەر نەبێ، غەرقم ئەمن

ئاوی چاوم گەر نەبێ، سووتاوم ئەز(نالی،١٩٧٨: ٢٢٢)

لێرەدا شاعیر بەبەکارهێنانی جێناوی کەسی سەربەخۆی (ئەز) ی زاری کرمانجی سەروو لە شیعرەکەی خۆیدا، لادانی زاری ئەنجام داوە.

## ٢-٨- لادانی نووسینی

لێرەدا شاعیر هەوڵ دەدات لە نووسینی باوی زمان لابدات و لەم ڕێگەیەوە دەقەکەی خۆی بەرجەستەبکات. بەمەش واتایەکی تر بخاتە سەر واتای دەقەکە کە بەر لەم لادانە هەیبوو. ئەم لادانە سیمای جیاکەرەوەی نێوان شیعری هاوچەرخ و شیعری کۆنە و بەپێچەوانی شیعری کۆن کە چەند قاڵبێکی دیاریکراوی هەبوو، ئەم لادانە وای کردووە کە شیعری هاوچەرخ سنوورێکی دیاریکراو نەبێ بۆ قالبەکانی. یاخود گۆڕینی ڕێسای نووسینی باو یا شکاندنەوەی وشەکانە بۆ تێکەڵ کردنی ئاسایی ڕۆنانی وشەکان.(سیماداد ١٣٨٥/٢٠٠٤: ٥٤٢) هەندێ جار شاعیر سوود لەجۆرێك لادان وەردەگرێت لە نووسیندا کە هاوشانی دەنگی نیە. بەدەربڕینێکی تر، شاعیر شێوەیەك لەنووسیندا بەکاردێنێت کە گۆڕان لە گۆکردنی وشەدا ناهێنێتەبوون، بەڵکو چەمکێکی لاوەکی دەخات سەر چەمکە سەرەکیەکە.(کورش صفوی١٣٧٤/١٩٩٣: ٤٧) بەمەش ئەم لادانە تەنها بە نووسین (بینین)ەوە پەیوەست دەبێ و کارناکاتە سەر دەنگ (بیستن). لە شعری کۆندا زیاتر بەشێوەی ڕەگەزدۆزیی ئۆرسۆگرافی و دەرکەوتنی جۆراوجۆری (موّشح ومدرّج) ئاشکرادەبن و چێژ لای خوێنەر دەخولقێنێت

و له شیعری هاوچەرخیشدا، کورتیی و درێژیی نیوەدێرەکان، فۆرمی پەیژەیی نووسینی نیوەدێرەکان و تەنانەت پیتەکانی وشەیەك، دەبنە هۆی داهێنانی لادانی ئۆرسۆگرافی. (**محسن نورپیشه قدیمی ۱۳۸٤/۲۰۰۳: ٥٦**) لەم جۆرە لادانە دا شاعیر شێوەی نووسینی لێکسیك دەگۆڕێت، واتە بە سوود وەرگرتن لە هێماکانی تایپکردن، گۆڕینی سپەیسی هێڵەکانی شیعر و فەزای نێوانیان، هەوڵ دەدات چەمکێك سەرەڕای چەمکی خودی لێکسیکەکە بۆ شیعرەکە زیاد بکات. (:N.Leech,1969)

- کاسەیەکی لەبن سمێلە فشە شانە نەکراوەکانی داناوە

له

بەر م ت

با ە ە

سەریەنیٚ چ وە و

روووەو

لمستان

دەچیٚ(ئەحمەد مستەفا نەجمەدین،۱۹۹٦: ٥٠)

لێرەدا شاعیر بە لادان لە شێوەی نووسین پێشان دانی کردەی چەمانەوە لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی دەنگەکانەوە لادانی نووسینیی ئەنجام داوە.

**٢-٩- لادانی ناوەکی**

کاتێك ڕوودەدات کە نووسەر لەو ئاسایی و لۆژیکەی کە زاڵن بەسەر بەرهەمی
ۆی لابدات. بۆ نموونە کاتێك کە بانگەشەی شتێك دەکات و دواجار لێی پەشیمان
دەبێتەوە.(سیماداد ١٣٨٥/٢٠٠٤: ٥٤٢)

وەرە بنوارە ***دوو دەستی حەنایی***م

***حەنایی چی؟*** ***هەمووی هەر خوێنە*** قوربان(نالی،١٩٧٨: ٣١٥)

لەم دێرەدا دوای ئەوەی کە شاعیر لە نیوە دێری یەکەمدا دەڵێ (دوو دەستی
حەنایی)، لە نیوەدێری دووەمدا پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێ (حەنایی چە؟) لادانی
ناوەکی ئەنجام داوە.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوە لەو ئەنجامانەی کە بەدەست هاتوون لە دەستنیشان کردنی هەرسێ جۆر لادان لە دیوانە ناوبراوەکانی هەر سێ شاعیر دەکەین. ئەم بەشە لە چوار بەش پێکهاتووە و هەر بەشێك لەم سێ بەشەش بە سەر سێ پاردا دابەش دەبێت.

لە بەشی یەکەمدا ئەو ئەنجامانەی کە بەدەست هاتوون لە لێکۆڵینەوەی لادانی واتایی لای هەرسێ شاعیر دەخەینە روو. لادانی واتایی لای هەر یەکە لەم سێ شاعیرە بەسەر چەند جۆرێکدا دابەش دەبن کە رێژەی سوودوەرگرتنیان لای هەریەکەیان لەگەڵ رێژەی سەدییان لە چەند هێلکاریەکدا نیشان دەدەین.

لە بەشی دووەمدا دەچینە سەر لادانە لێکسیکییەکان، ئەم لادانە دوای دابەش کردنی بەسەر هەر دوو جۆری ١- لادانی لێکسیکی دارێژراو ٢- لادانی لێکسیکی لێکدراو لێی دەکۆڵینەوە. رێژەی سوود وەرگرتنیان بەهۆی هێلکارییەوە روو دەکەینەوە.

لەبەشی سێیەمدا لە لادانی نووسینی دەکۆڵینەوە و رێژەی بەکارهێنانی لای هەریەکە لە سێ شاعیرەکە لەرێگەی هێلکارییەوە روون دەکەینەوە.

لەبەشی چوارەمدا پوختەی ئەنجامە بەدەست هاتووەکانی ئەم باسە بەشێوەی هێلکاری و خشتە نیشان دەدەین.

## ٣-١ لادانەکان لای فەرهاد پیربالْ

### ٣-١-١- لادانی واتایی

ئەم لادانە ٤١٦ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٨٤,٧٢٪ ی کۆی گشتی لادانەکان. بەم شێوەیە:

### ٣-١-١-١- بەمرۆڤکردن

بەمرڤکردن ٢٩٥ جار بینراوە کە دەکاتە ٧٠,٩١٪ ی هەموو لادانە واتاییەکان. ئەمانە چەند نموونەیەکن:

پەنجەرەکانت لە خۆ تۆراند، ئەستێرەکانی پشتیان تێکردی EXIL،ل ١٠

لێرەدا شاعیر سەرزەنشتی بەرامبەرەکەی دەکات و پێی دەڵێ تۆ کارێکی خراپت دەرهەق بە پەنجەرەکان و ئەستێرەکان کردووە و ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە پەنجەرەکان لێت بتۆرێن. بەمەش کاری تۆران ، کە تایبەتە بەمرۆڤ، داویەتە پاڵ پەنجەرەکان. بەمەش مامەڵەی مرۆڤی لەگەڵ پەنجەرەکان و کردووە. هەروەها کاری پشت تێکردنیش، کە تایبەتە بەمرۆڤ، داوەیەتە پاڵ ئەستێرەکان. یان:

. . . هەنگاوی لەگەڵ یەکتر دوژمن،

هەنگاوی لەگەڵ یەکتر لالووت؛ EXIL،ل ٢٢

لەم نموونەیەشدا هەریەکە لە سیفەتەکانی (لالووت و دوژمن)، کە تایبەتن بەمرۆڤ، داویەتە پاڵ هەنگاو.

چەند نموونەیەکی تر

<u>ڕۆژە</u> خۆشە <u>ئاسوودە</u> و زێڕەوشانەکان

ئێوارانیش، کە دەهاتەوە، <u>سەرشانەکانی</u> EXIL، ل ٥

ئەو <u>تەلەفۆنە</u> <u>میهرەبانەیە</u>، کە لەناکاو

مژدەی سەرلەنوێ ڕووانەوەی ڕەز و ڕووبارە ڕەنگینەکانی <u>پێم ڕادەگەیاند</u>. EXIL، ل ٥، ٦

ئاخۆ چیتر سەروقژی ئەندێشاوییی سنۆبەری سەر ڕێگاکان دەبینمەوە؟ EXIL، ل ٦

* ئەی ڕۆژە خۆشە ئاسوودەکان! ئەی ڕۆژە پڕ پەلکەزێڕینە و زەردەخەنەکان! EXIL، ل ٦

* . . . چەند دلۆپە حەسرەتێکی قەتیسماون لەژێر ڕەشماڵە دەرکراوەکان EXIL، ل ٦

* لەناو قژی دارچواڵە سنگ سووتاوەکاندا: EXIL، ل ٦

* لە ژوورە تەنیا و دەربەدەرە پیرەکانیشدا، لە چوارچێوەیەکی دیوارینی دیل. EXIL، ل ٦

* ئەی بارانی ولاتەکەم! Exil، ل ٨

* لێم ببوورە! Exil، ل ٨

* ئەی نێرگزی بسك زەردی ولاتەکەم! Exil، ل ٨

* لێم ببوورە! Exil، ل٨

* لێم ببوورە ئەی ئەو چارۆگە فرمێسکاوییەی کە بەسەر تەرمی نیشتیمانە کوژراوەکەم دادراوی! Exil ل٨

* کراسی بەری دارسێوێکت بۆ بخوازمەوە، Exil، ل ١٠

* جەژن:

کە دایکم بوو، دەنوشتایەوە ماچی دەکردم. Exil، ل ١١

* غەریبیی ئەو دەنگە ڕەنگینە میهرەبانەی کە ئێواران، کاتێ دەچوومە دەرەوە، پێم دەگوتم: Exil، ل ١١

* ژێر درەختێکی بچکۆلانەی قژ خەنەیی بوو جێ ژووانی، Exil، ل ١٢

* بەختەوەری، وەك کچۆلەیەکی شان و مل ڕووت

قژ فرمێسکاوی

لە کونجێکی ژوورەکەمدا هەلکورماوە، هۆن هۆن دەگری:

بێ ئەوەی پێم بلێ بۆچی، بێ ئەوەی وەلامم بداتەوە. Exil، ل ١٤

* گۆرانییە بالا بەرزە تازەزاوا ئاسوودەکانی مشکۆ Exil، ل ١٥

* من له خەمی *کانییە ساوا*، *گولیلکە* تازە ڕوواوەکاندام: گەلەك *نەفام* و *بێ چەپەرن*. ئاخ

Exil، ل ١٦

* نه ئەو *وێنە فۆتۆگرافییە دڵخۆشانەی* له سەردانی هەواری عیشق و ئاهەنگەکان دەگەڕێنەوە

Exil، ل ١٦

* ئەو ڕۆشناییە به شەبەنگەی، که نیوە شەوان، له *پەنجەرەی دەم بەخەندەی* ژوورەکانمان

Exil، ل ١٨

* یەکەمین *ماڵی میهرەبانم*:

ژوورێکی گەرمی به تاریکی زێڕەوشان بوو؛ *دەری کردم*. Exil، ل ١٩

* *ژێ* زیوینە زامدارەکانی گیتارەکەم

*هۆن هۆن دەگرین* Exil، ل ١٩

* *شتێکی* بچووك، ئەگەرچی ساکار، تا *خەم حەز بکا* هۆن هۆن دەیگریاندم.

لەسەر *تەپۆلکەیەکی لەهۆشخۆچوو*، لەژێر سێبەری سەربڕاوی درەختێکدا

پێمان نەکرا ئەوانیش لەگەڵ کۆرپە و منداڵ و پیرە ژنەکان *بنێژین*

Exil، ل ٢١

* یەك دوو تاکە *نەعلی کەساس*، هێلکەو ڕۆنێکی مێش لێنیشتوو،

ئەمانەن یادگاری و شتەکانی له دووای خۆمان *دەیبەخشینە گۆڕ*.

Exil، ل ٢١

* له *تاجێکی* شکاوی *درۆزنی* نەزۆك . . . Exil، ل ٢٢

* *گۆڕی فرمێسکێك* Exil، ل ٢٢

* *مەیتە* خۆشخۆراك، *میواندۆستەکان*؛

*مەیتە ڕێکپۆشە ئاسوودەکانی* ئەورووپا. . . Exil، ل ٢٣

* مەیتەکان؛ *مەیتە ڕێکپۆش*، *ئاسوودەکانی* ئەورووپا Exil، ل ٢٣

* له مەیدانی پانتۆمیمی نێو *پایتەختە لنگ ڕووتەکاندا*

لەپێش دەرگای باڵوێزخانە شووشەییەکاندا، لەژێر چەند *لافیتەیەکی لاڵی ڕەشپۆش*
Exil، ل ٢٣

* چاوەڕێ دەکەین *بەبەغایەکی* چاوشینی *درۆزن*. . .
Exil، ل ٢٣

* لە مەیدانی گشتیی ناوشار، چاوەکانیان دەبەستنەوە و *تیرباران دەکرێن!*
Exil، ل ٢٤

* *لە* هەموو *سمۆرەیەکم پرسیوە*، لە هەموو پۆلە *واژەیەکی بەناو ساڵکەوتووی*
Exil، ل ٢٥

* هەر *تراویلکەیەک* لە درەوشانەوەی ئاسوودەی خۆیدا *بانگم بکا*، بەرەو ڕووی دەچم
Exil، ل ٢٥

* لە ئێوارەیەکی وێرانکراوی وردو خاشدا بوو کە *ماڵئاواییم لەو خانووە کرد*:
*هەنگاوەکانم* ئاوڕیان لە دەرگا هەورینەکەی دەدایەوەو
*هۆن – هۆن دەگریان.*
Exil، ل ٢٦

* *پیرەدارە سەر و پرچ و ڕیش سووتاوەکە*، *چاوی پڕ ڕووندك داهات*، *وتی*:
*وتی*: ( (نازانم
*وتی*: ( (نازانم، لە چاوان کوێر بم؟
Exil، ل ٢٨

* *پیرەدارە سەرو پرچ و ڕیش سووتاوەکە*، *هۆن هۆن* لەگەڵم *هەنسکی دەدا*
Exil، ل ٢٨

* دەشێ ئێستا، *ژنێیەکی دیکەش*
*چاوە برژانگ شەلالی خوێن سوورەکانی لێك بنێت* و نەیبینمەوە!
Exil، ل ٢٩

* *ڕۆژنامە* پەرپووتە *ئاوارەکان* بێ سۆنگە نیە دەناڵێنن
بەدیهیاتە ڕۆتینە ڕەتێنەکان *دەڵێنەوە*. . .
بێ سۆنگە نیە *تەبای منداڵێك*: لەناو بازاڕێکی گەورەدا ونبوو، *دەزریکێنن*
Exil، ل ٢٩

* دوێنێ شەو بوو، بینیم: شینکاوێك، کەنارەکانی پێچایەوەو خۆی نقوومی ژێر زەوی کرد.
Exil، ل ۲۹

* بیر لەو تەناقە گڵۆپە زەرد و سوور و وردیلانەی کە بە پەرۆشن لە شەوانی ئەگلەنجەکاندا

بەسەر شانی تاق و پەنجەرەی خۆشی نەدیوی ماڵەکانمان بدرەوشێنەوە.

من بیر لەو پاسکیلە گوناحە هیلاکانە دەکەمەوە کە کرێکارەکان دەمەو نوێژان

بە دیواری میهرەبانی مزگەوتەکانیان هەڵدەپەسارد. Exil، ل ۳۰

* چۆڵەکەیەکی پەرشکاوی لاڵ Exil، ل ۳۱

* زەردی و غەمگینیی سیمای پێم دەڵێ: Exil، ل ۳۱

* ئاوازی ڕەنگیان دەپرژاندە سەر ئێوارە ئاسوودەکەی خۆشەویستیمان.

Exil، ل ۳۲

* نۆڕصێك وەکو بەختەوەرییەکی لامل شین لەو لامانەوە هەڵنیشتبوو.

من پێم وت: دە، بۆ عەشقمان. . . بخوێنە!

تۆ پێت وتم: نا، ئازیزەکەم، ژیان کورتە، ساتەوەختێکە Exil، ل ۳۲

* سەیری پۆل پۆل پەڵە هەورە غەمگینەکانی ناو سێنمان دەکرد؛

وەکو باڵیی تەرمی ئەوینێکی ڕێبوارانە بگوازنەوە: Exil، ل ۳۲

* . . . پەلکەزێڕینەی ڕێگا ئاسوودە، باخچە زێڕەوشان، چایخانەکان فێریان کردم کە. .

Exil، ل ۳۳

* ئێوارەیەکی خۆشی ئاوها بوو کە ڕاپەڕینی هێڵ و ڕەنگە ئازادیخوازەکانی سەر شەقام بانگیان کردم: دڵبلندانە، بەرەو زندان ڕاپێچ بکرێم. Exil، ل ۳۳

* نرکە و ناڵە ئاویلکەدانی شەقامەکان بانگیان کردە شار: ناو جەرگەی شار.

Exil، ل ۳٤

* تیشکی بەخشندەی تریفەی واژە تازەکانی Exil، ل ۳٤

* چاپخانەکان، شەقامەکان، نامیلکە و بەیانە نهێنییەکان پرسەیان بۆ داگرت.
Exil، ل ٣٥

* شەهامەتی، هۆن هۆن فرمێسکی بۆ هەڵدەرشت. Exil، ل ٣٥

* تەرپیی باران لەبیری کرد Exil، ل ٣٥

* سەوزیی گەڵا لە بیری کرد

شەونم، بەهار، کۆڵانەکان، گفتوگۆکان. لەبیریان کرد. Exil، ل ٣٥

* ئەی نیشتمانم؛ لە تەنیشت بەهار Exil، ل ٣٦

* ئەی نیشتیمانم؛ لە تەنیشت خۆر Exil، ل ٣٦

* ئەی نیشتمانم Exil، ل ٣٦

* ئەی نیشتیمانم، ئەی رۆحی برینداری لە گیانەڵادا! Exil، ل ٣٦

* لە قوژبنێکی کەسیرەدا Exil، ل ٣٧

* گەڵا سلاو لە گەڵای خوشك، هاوسێی خۆی ناکا.

مانگیش: تەنیا، مەگەر بۆ جگەرەو شقارتە کرین لە ژوورەکەی خۆی بێتە دەرەوە.
Exil، ل ٣٩

* هیچ کەس فرمێسکی پەیکەری بەرزی ناو مەیدانەکان نابینێ . . .
Exil، ل ٣٩

* کەسیش نازانێ: ( (مرۆڤایەتی)) ئەو کچە جوانکیلە لادێیە شار غەریبە رۆژگارێکی یەکجار زۆرە لە شوقەیەکی فەرامۆشکراوی ناو ئەم پایتەختە ئاسنییەدا گیانی سپاردووە، کە ڕووی هەڵناوە. Exil، ل ٣٩

* چەندین جەژن گوزەریان کرد و هیچ بەیانییەك هەڵنەستامەوە بە دوو دەستێك، بە دوو چاوێك بڵێم: ( (جەژنت پیرۆز بێ))! Exil، ل ٣٩

* - ئەی دەنکە خۆڵە بچکۆڵەکانی کۆڵانەکەمان،
ئەی دەنکە خۆڵە دێرینە خۆشەویستەکەم. . . چەنێکت بیر دەکەم!
Exil، ل ٣٩

* بیر لەو ***گوڵدانە گوڵشەبقە میهرەبانەی*** حەوشەکەمان دەکەمەوە
کە ئاخرین ڕۆژی لە تاو سێدارە سەرهەڵگرتن بۆ سەفەرم ***گریا***، ***وتی***: ( (بەجێم مەهێڵە)).
Exil، ل ٣٩

* بیر لە ***گۆرانییە*** بریندارە شەوگەڕە لانەوازەکانی مشکۆ دەکەمەوە
کە لە ***شەقامە*** تاریك و ***مەست*** و ساردەکانی نیوەشەوان
بێ پەنا، بێ ئەنوا، دەلالانەوە.
Exil، ل ٤٠

* نێوانمان هێندەی ***بەدبەختی*** و ***لاتی*** و ***وەی حەزبکا***، لە یەکتر دوورە:
Exil، ل ٤١

* نێوانمان هێندەی ***تاراوگە*** و ***خەم*** و ***خەفەت حەز بکا*** لە یەکتر دوورە
Exil، ل ٤١

* هەر خۆشت ***بەو*** ئینسان و ***وڵاتانەی ڕۆژهەڵات دەڵێی***:
Exil، ل ٤٣

* ***ئەی دەریای*** شینی بەڵتیك، ***ئەی سەربەستیم***!
***ئەی هاژەی پڕ شەهامەتت***: شکۆفەدانی جورئەتی من!
شەپۆلەکانت؛ ئێستا خامۆش، پێ دەچێ تاوێ ڕێگەم بدەنی ***لەگەڵتا بدوێم***:
Exil، ل ٤٧

* بە نرکە و ناڵەت: خۆشترین ***گۆرانی***
بۆ ***پەڵە هەورە سەوداسەرە*** کۆچەرەکانی دەوری خۆت ***دەڵێی***!
ئەی هەموودەم بە ***گریینت***: گەشترین مرواری
Exil، ل ٤٧

* تۆ بە ئاوڕدانەوەت لە کچە گوڵی لێواران و شتکردنە ***کەزیی*** شەهوەتاویی ***شۆڕەبییەکان***
Exil، ل ٤٧

* دیسان هاتووم، بە ئاخرین/ نرکەی/ بێ هێزی/ لە گیانما/ ماوە، ***لێت پرسیم***:
( (کەی ***باوەشت بۆم دەکەیتەوە***؟ کەی تێکەڵی خۆتم دەکەی. . ؟!
Exil، ل ٤٧

* ئاهـ، ***ئەی دەریا***!
Exil، ل ٤٧

* چاوم ئەوەندەی لە چاودڕوانیدا سەیری *ئاسمانە میهرەبانە* دوورەکان بکا
Exil، ل ٤٨

* دلّم ئەوەندەی لە پاییزاندا، لەگەڵ *گوڵاڵە ئەوینداره* تەمەنکورتەکان هەڵبپڕووکێ، هەڵپڕووکا.
Exil، ل ٤٨

* *وشەکانم* یەك یەك *مردن*.
Exil، ل ٤٨

* *گەڕان* و *سووڕان* و *پیاسەکانیشم* هێندە *بێ ئۆقرەن*، هێندە هیلاکن
Exil، ل ٤٨

* *داهاتووی بێکەس*،
Exil، ل ٤٨

* بۆ ئەو *درەختە قژ ئەندێشاوییە کراسی بەر داپچڕاوانەی*
Exil، ل ٤٨

* بۆ ئەو *پەیژە* بچکۆلانە *لە هۆشخۆچووەی* کە بە دیواری حەوشەکەمان هەڵدەپەسارد و
Exil، ل ٤٩

* پاشماوەی غەمگینی جوانترین *خەون و خەیاڵاتی گوڵاڵە سووره ئەوینداره‌کانن*.
Exil، ل ٤٩

* حەز دەکەم بە *ڕقی تەورداسێك* وردو خاشت کەم!
Exil، ل ٥٤

* *ئاسوودەیی خۆی شانە دەکرد* ؟
Exil، ل ٥٤

* تۆ- *ئەی شیعر*
Exil، ل ٥٤

* لە پاڵ *وەهمێکی ڕاکشاوی* ڕووباریندا هەڵوەری، تکا. .
Exil، ل ٥٦

* دەچم لە باڕی ئیسپانییەکان تا *بێداربوونەوە* ی *بەندەر* و *پارە* و *پاپۆرەکان* دادەنیشم:
Exil، ل ٥٧

* *حەز* و *هەوەس* و *خۆشەویستی* شەو و ڕۆژ *بێدار*. . .
Exil، ل ٥٨

* بستێ زەویی میهرەبانم نەدۆزییەوە کە خەونەکانمی تیا بڕوێنم؛

Exil، ل ٥٩

* بە زەردەخەیەکی کەیفخۆشەوە بە یەکتر دەڵێین: ( (ئێوارە باش)).

Exil، ل ٦٠

* بەهەرچی چاوێکی میهرەبان و جوان ببینم دەڵێم ئاه دایکی شیرینم

Exil، ل ٦٠

* هەرچی وەهمێکی ناو قەدباریك و کۆك ببینم پێی دەڵێم ئاه، دەزگیرانەکەم. . !

Exil، ل ٦٠

* کە خۆر کراسێکی نیوەتاریك دەکاتە بەر شەقامەکان؛ یادم کەوە!

لەو کاتانەدا حەزدەکەم ڕوخساری خۆڵ و خەفەت لەسەر نیشتووی

Exil، ل ٦١

* کە خۆر کراسێکی ماتەمینپۆش دەکاتەبەر دوریانەکان؛ یادم کەوە!

Exil، ل ٦١

* کە خۆر کراسێکی وەنەوشەیی دەکاتە بەر درەختەکان؛ یادم کەوە!

Exil، ل ٦١

* ئەی بیرەوەرییە پڕ دڵۆپەی باران — Exil، ل ٦٢

* ئەی یادگارە دەم بە خەندە، یەخە و مل کۆك، سەر و قژ شانە لێدراوەکان!

ئەی ڕۆژانی نۆزدە ساڵەییم، ئەی گەنجێتیم! تاسەتان دەکەم! — Exil، ل ٦٢

* گەنجێتیی من پاڵەوانێکی ئەفسانەیی بوو

دای لە کێوێکی سەختی دژوار و نەگەڕایەوە.

ئاسوودەیی من: گۆرانییەکی سەرهەڵگرتوو بوو

تایەکی مۆری کوشندەی گرت و هەڵنەستایەوە. — Exil، ل ٦٢

* ئەی یادگارە منداڵییەکان

ئەی بیرەوەرییە باڵا بەرزە کراسی هاوینە قولکورتەکان!

*ئەی ڕۆژانی* شەلاڵی عەتر و ئاواز و سەفەر!
*ماڵئاوا*. . Exil، ل ٦٢

* سەیری *کۆڵانە* بە بۆنی مووورتك *سەرمەستەکانمان*
سەری *پەلوپۆی میهرەبانی* دارلاو لاوی دەوری دیواری ماڵەکانمان Exil، ل ٦٣

* من باس لە بەسەرچوونی جوانی دەکەم. باس لە *هەنگاوە* لافاوییەکانی
*تاریکی*. Exil، ل ٦٥

* من باس لە ترسی نەمانی *بەهانەکانی خۆشبەختی* دەکەم.
باس لە *ژووانی* هەمیشەیی نێوان *وەفا* و *خیانەت*، پێکەوەیی و لێك دابڕان
Exil، ل ٦٥

* چرپەی سەوزی، *ڕۆحی خەوالووی* بێدار کردمەوە. Exil، ل ٦٧

* *کاتژمێری لەهۆشخۆچووم گیانی وەبەر داهاتەوە*. Exil، ل ٦٧

* بەیاتریس، *بەیاتریسی میهرەبانیش*: Exil، ل ٦٨

* ئەوەتا: *ئەوین*، *قژ ژاڵەی ژاکاو*، لە کونجێکی ئەم ژوورەدا هەڵکورماوەو
*زەبوونانە* تەماشای چارەنووسی *گوڵاڵە سووورە ئەویندارەکان* دەکات
تەماشای تنۆکە خوێنە ڕەشهەڵگەڕاوە پیسەکانی دەوری خۆی دەکات و *هۆن هۆن*
*دەگری*. Exil، ل ٦٩

* وشە خەونییە سەوزەکانمان چۆن لەسەر *لێوە لەهۆشخۆچووە* مۆرەکانماندا
سیسەنبەر ئاسا سیس هەڵدەگەڕین! Exil، ل ٦٩

* لەنێوان هەر *گەڵایەکی* سەوز و *زەمینەدا ژووانێك هەیە*. Exil، ل ٧١

* لەو *ئاسمانە میهرەبانەدا*
*نیشتمانێکی* هەمیشەیی *ئاسوودەم* هەیە،
لە *شەقامە ئاوارەکانیشدا* Exil، ل ٧٥

* لە تەنیشت *جوانییە میهرەبانەکاندا* Exil، ل ٧٥

* *ئەی* ئەو *چرپە*، وەکو چرپەی پشکووتنی گوڵ عەتراوییەکان!

ئەی ئاوازە وەك ئاوازە ئاسمانییە دڵنەوازەکان، Exil، ل ٧٧

* ئەی میهرەبانییە جۆڵلانەییە دێرینەکان!

ئەی قسە و سۆزە باوەشییە بەخشندەکان! Exil، ل ٧٧

* پێیان بڵێن: ئاسوودەیی Exil، ل ٧٧

* ئەی شەو بگری!

ئەی غەم بگری!

ئەی ڕۆح بگری! Exil، ل ٧٨

* مەیتی نازداری یادگارەکانا ! Exil، ل ٧٨

* چەندین ساڵ بوو: درەختە تەنیا، نائومێدەکان خۆیان لە زێ و زۆنگاوەکان
ئەدەهاویشت

دەیانزانی ڕۆژێ من و تۆ لە سێبەریاندا دەحەسێینەوە. Exil، ل ٨١

* دەست لە ملی ڕووباری ڕووت ڕادەکشام و ڕۆحم دەینرکاند: Exil، ل ٨١

* دەنگێکی جوان، لە دوورەوە، پێی دەگوتم: دێی. Exil، ل ٨١

* لەسەر گۆڕی گەنجێتیمدا خۆت داگیرساند و Exil، ل ٨١

* مردم هێندەی لێرە قاوەی ساردی نێو ئێوارە ئاوارەکان بخۆمەوە

Exil، ل ٨٢

* گوێ بۆ گۆرانییە سەرهەڵگرتووە پڕ ئاهەنگەکانی Exil، ل ٨٢

* بەیانی باش، ئەی تاڵە تیپشکە نارنجییەکان!

بەیانی باش، ئەی غەڵبەغەڵبە غەوارە لە خەو تازە هەڵساوەکان!

بەیانی باش، ئەی تریفەی سپیانە ماندوو ژەنگ و تەپ و تۆز لێنیشتووەکان!

Exil، ل ٨٣

* من ئەو دەگا میهرەبانەی کە هەموو ڕۆژێك لێیەوە دەردێم، خۆشم دەوێ.

Exil، ل ٨٣

* لەم پایتەختە بێ متمانە و چیمەنتۆییەدا

که *ئەوین* خەریکە *ماڵئاوایی* *لە شۆستە* تەنیا و ماندووەکان *دەکا*
Exil، ل ٨٤

* لێوەکانی
تێر ماچ ناکەن *لێوی ڕووبار* و . .
*دەمرن.*
*سەوزیی بەهار* و. .
*دەمرن.* Exil، ل ٨٥
* *ئەوینی تۆ* — *ئەی وڵاتەکەم* Exil، ل ٨٦
* *دەرت کردم* Exil، ل ٨٨
* هەر بە یەکجاری *فڕێیم بدە* ناو زەریامردنێنکی ئەم غەیبییەوە- Exil، ل ٨٨
* *دەرت کردم.* Exil، ل ٨٨
* *دەرت کردم.*
* *ڕووم تێ کەوە:* Exil ، ل ٨٨، ٨٩
* *دایکێکی* باوەش گەرمی تۆ لەوێ. Exil، ل ٨٩
* هەر بەیەکجاری چۆن عەرەبە جاهیلییەکان
کچە ((زیاد)) و زەبوونەکانیان لە گۆڕ دەنا، *لە گۆڕم نێ*-
یا *لە ئامێزی خۆتم بگرەوە:* Exil ، ل ٨٩
* *بانگم کەوە*
*هەڵمگرەوە*
:
*ببەرەوە*-
*ئەی کوردستانە* خۆشەویستە دوورە دەستەکەم،
*ئەی یادگارە* بەهەشتییە خاپوور کراوەکەم! Exil، ل ٨٩
* - من *دەنگی* زەنگی زرنگانەوەیەکی سامناك *بانگی کردم.* Exil، ل ٨٩

* هەموو *بەیانی* و *ئێوارەیەکی* زەردی *شپرزە*، . . . هەمان زەنگ *بانگی ئێمەش* *دەکا*.
Exil، ل ٩٠

* لەسەر شۆستە بە پەڵەخوێن سوورەکاندا، لە *شەقامە* *وەك* *ماڵ لێقەوماو*
Exil، ل ٩٠

* *سەفەر مەکەن*، *مەڕۆن*!
Exil، ل ٩١

* *کۆچ مەکەن*، *مەڕۆن*!
Exil، ل ٩١

### ٣-١-١-٢- بەتەنکردن:

ئەم لادانە واتاییە بەرێژەی ٢٨ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٦,٧٣٪ ی کۆی گشتی لادانە واتاییەکان. سەیری ئەم نموونەیە بکە:

ناسرِ پردێك بوو لە نێوان پەنجەرە و کۆڵان،
کە ئێوارە ژەنگگرتووەکان لاشەی بۆگەنبووی برینەکانمان تێدا دەناشتن EXIL
ل ٥٥

لێرەدا سیمای واتایی [+تەن] دراوە بە منداڵی کە لە بەکارهێنانی ئاساییدا سیمای واتایی [- تەن]ی هەیە. ئەمیش لەرێگەی رەنگ پێدانی. هەروەها بڕوانە:

دوێنێ شەو بوو، بینیم: شاعیرێك،
هەرچی *جوانیی* شارەکەی هەبوو *پێچایەوە*و سەری خۆی هەڵگرت EXIL،ل ٢٩

لەم دەقەدا شاعیر سیمای [+ تەن] ی داوە بە جوانی ئەمیش لە رێگەی کردنی بە بەرکاری کاری پێچانەوە کە لە زمانی خۆکاردا ئەم کارە پێویستی بە بەرکارێکە

که سیمای [+ تەن] ی هەبێ لەکاتێکدا (جوانی) لە زمانی خۆکاردا سیمای [- تەن
ی هەیە بەمەش بەتەنکردن رووی داوە.

هەندێ نموونەی تر

* کە رۆحی خۆمی تیا حەشار بدەم. Exil، ل ١٣

* لە لووتکەی خۆشی و لەززەتەکاندا ، لە باوەش یەکتر، کە خەریکن ببێ
بەیەك: Exil، ل ١٦

* پەنجەرەکەی بە پێشبینییەکی لاکێشەیی تریفەدار؛ Exil، ل ٢٥

* پرسیم: ( (هیچ کچی چاو خەنەییت دیت کە باری شیعر و سۆز و یادگاری بە کۆ
دادابێ؟ Exil، ل ٢٨

* ( (هەریەکە و نەختێ سروە و ڕەنگ و خۆڵ، مشتێ ئاوازیان لەگەڵ خۆیا
هەڵگرتبوو

( (سەگ غاریان دەدا و بۆنی ژەهریان لەخۆ دەتەراند Exil، ل ٢٨

* هەرچی جوانیی شارەکەی هەبوو پێچایەوەو سەری خۆی هەڵگرت
Exil، ل ٢٩

* پاکی و ڕووتیی قەراغ زێیەکانی خۆیان پێچایەوە Exil، ل ٢٩

* کە دەستت بۆ درێژ دەکەم: لێم دەبیتە گۆرێکی سارد. Exil، ل ٦٩

* من دەرۆستی هەڵگرتنی باری غەم و حەسرەتی تۆ نەدەهاتم Exil، ل ٧٤

* مشتێ ئاواز و بۆن و لەززەت. Exil، ل ٧٥

تۆ لێواری. Exil، ل ٨٥

ئەوینی تۆ — ئەی وڵاتەکەم

لەم جیهانی دەربەدەری و ونبوونەدا

شارێکایەکە Exil، ل ٨٦

ئەوینی تۆ — ئەی دەزگیرانەکەم

لەم جیهانی بەستەڵەك و کرێوەیەدا

*ئاگردانێکە* Exil، ل ٨٦

* *شمشاڵێکی بێناز کەوتووم من* لێرە Exil، ل ٨٨

* *ئاوێنەیەکی تەڵخم من* لێرە Exil، ل ٨٩

* کە دەبینم: لەجیاتی *تۆزی خەم* و *حەسرەتی* سەر ڕووی ئێوە Exil، ل ٩١

**٣-١-١-٣- بەئەبستڕاکتکردن:**

ئەم لادانە واتاییە بەرێژەی ١٦ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٣,٨٤٪ ی کۆی گشتی لادانە واتاییەکان. سەیری ئەم نموونەیە بکە:

بە خۆمم دەگوت: ئەوین EXIL،ل ٤٩

لێرەدا خۆی چواندووە بە ئەوین کە لە زمانی خۆکاردا سیمای واتایی [+ئەبستڕاکت]ی هەیە. هەروەها بڕوانە:

تۆ وەك مۆسیقایت، وەکو خەون، وەکو وەخت، وەکو ئاسوودەیی
EXIL،ل٦٦

لەم دەقەدا راناوی (تۆ) چوێنراوە بە (مۆسیقا، خەون، وەخت و ئاسوودەیی) کە هەموویان سیمای واتایی [+ ئەبستڕاکت] یان هەیە لەکاتێکدا راناوی (تۆ) لە زمانی خۆکاردا سیمای واتایی [- ئەبستڕاکت] ی هەیە.

هەندێ نموونەی تر

وەك ئاوازێك، لەسەر *گردە تریفەییە* ئاپوورەکاندا، هەڵبەز هەڵبەز، دەلەنجایەوە
Exil، ل ...

گشت سپێدەیەك، لە پەنجەرەی ماڵەکەمانەوە: *پۆلە مامز*
*تەبای چەند پەیڤێکی* قاچ و قول گیایی، لە کەسکایی هێمنی کێڵگەکاندا دەلەوەڕان.
*حاجی لەقلەقێك*، *بەختەوەرییەکی سپی ئاسا*
بەسەر *پۆپەی ئەنلێشاویی* درەختێکەوە، بۆنی تاریکایی شەوی لەخۆ دەتەراند
Exil، ل ...

*تۆ*، ئێوارەیەك، لەبەر دڵی من. *وەك خۆشەویستی*، خۆت ڕووت کردەوە.
Exil، ل ١٠

* لەجیاتی هەڵبەز هەڵبەزینی سەرگرد و *تەپۆلکە تریفەییەکان*، لەجیاتی
سەفەر، لەجیاتی پیاسە،
ئەو *ئاوازە*
ماتەمینبارە
حەسرەتاوییەی
لێکدابڕانیش
تا هەمیشە
*وەك منداڵیم*
بە قەد مەرگ
لە گوێچکەمدا دەزرنگێتەوە. Exil، ل ١٦

* *بازاڕ* ڕۆژنامە بوو، *پیاسە* بوو Exil، ل ٣٨

* *دەرگا*، *واتە*: *ئاسودەیی*
*دەرگا*، *واتە*: *شەقکردنی دیوارێکی* ئەستووری نەزۆرك بەرەو ئاسۆ. . .
Exil، ل ٨٣

* *تۆ بەهاری*. Exil، ل ٨٥

**٣-١-١-٤- بەرەوانکردن:**

ئەم لادانە واتاییە بەرێژەی ٣ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٠,٧٢٪ ی کۆی گشتی لادانە واتاییەکان. سەیری ئەم نموونەیە بکە:

پاپۆرە درێژە باخچەییەکان بە ژێرماندا کە تێدەپەڕین
وەکو تاڤگەی ئەستێرەیین EXIL،ل ٣٢

لێرەدا پاپۆڕ بە تاڤگە چوێنراوە و تاڤگەش لە بەکارهێنانی خۆکاردا سیمای واتایی [+ رەوان]ی هەیە.

هەندێ نموونەی تر:

* لە پاڵ وەهمێکی ڕاکێشاوی ڕووبارێندا هەڵوەری، تکا. . Exil، ل ٥٦
* وەك ڕووبارێکی ڕووتی گەمرەنگ Exil، ل ٨٤

**٣-١-١-٥- بەئاژەڵکردن:**

بەئاژەڵکردن ٢٨ جار بینراوە کە دەکاتە ٦,٧٣٪ ی هەموو لادانە واتاییەکان. ئەمانە چەند نموونەیەکن:

کاتێ هەستی بێ وڵاتی و بێهوودەیی
لەناکاو چنگیان گرتە سەر هەموو ئینجێکی رۆحم EXIL،ل ٣٣

لەم نموونەیەدا چنگ گرتن کە لە سیفەتەکانی ئاژەڵە دراوەتە پاڵ وشەی هەستەوە.

لێم دەبنە پۆلێ گۆرانی و بەسەر کەپۆلی تەنیاییمەوە هەڵدەنیشن
دەنووك لە برینی هەستی بۆگەنبووی ئاوارەیی و بێکەسیم دەدەن. EXIL، ل ٥٨

لێرەدا کاری هەڵنیشتن و دەنووك لێدان دراوەتە پاڵ گۆرانییەوە و وەکو ئاژەڵ مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە.

هەندێ نموونەی تر:

ئەو چرپە چرپە نارنجییانەی کە دەتگوت نرکە و ئاویلکەدانی. . .

دەتگوت ڕەوە مامزێك بوون

Exil، ل ١٤

لەسەر تەپۆلکەیەکی لەهۆشخۆچوو، لەژێر سێبەری سەربڕاوی درەختێکدا

Exil، ل ٢١

بە نیگایەکی مردارەوە دەڕوانینە

Exil، ل ٢١

* لاشە و کەلاکی بۆگەنکردووی تا چاو هەتەردەکا گیا، خۆشەویستی، ڕووناکییەکان.

Exil، ل ٢١

* تەنانەت پەنجەرە، پەرنجەرەی بستەزمان

Exil، ل ٢١

* لە هەموو سمۆرەیەکم پرسیوە، لە هەموو پۆلە واژەیەکی بەناو سالکەوتووی

Exil، ل ٢٥

* دەشێ ئێستا چایخانەیەکی دیکەش، شەقامێکی دیکەش لە گیانەلادا بن و نەیانبینمەوە!

Exil، ل ٢٩

* نۆڕصێك وەکو بەختەوەرییەکی لاملشین لەو لامانەوە هەڵنیشتبوو.

Exil، ل ٣٢

* مێروولەی لێوت، پەنجەکانت تاکو ناو هەناویشیان دەڕوا. . . Exil، ل ٣٩

* وەك جووتێ مراوی لێوینەکەشم خۆش دەویستی! Exil، ل ٤٠

* چەنێ جوان، چەن شیرین بووی: وەك پەپوولەیەکی پەمبەی گەورە

Exil، ل ٤٠

* کە بە کەنار دەریایەکدا ڕادەبووری، پێت ئاساییە گوێت لێ دەبێ ناڵە و نرکەی،

Exil، ل ٤٣

* نەرمایی بێچووە مەمکەکانت

Exil، ل ٧٠

* دەیانزانی دووچاوی تەبای ڕیشۆڵە شینت ڕۆژێ دێن و لەبەر پەنجەرەی تاراوگەی مندا هەڵدەنیشن.

Exil، ل ٨١

* پێیان بڵێ: وەك ئەو چۆلەکانەی سەر درەختی شەقامە لەپڕ قلیشاوەکان لەگەڵ زرنگەی هەر گوللەیەك لە شەقەی باڵ نەدەن، نەفڕن.

Exil، ل ٩١

### ٣-١-١-٦- پاڕادۆکس

ئەم لادانە واتاییە ١٦ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ڕێژەی ٣,٨٤٪ ی هەموو لادانە واتاییەکان. بڕوانە ئەم نموونە:

ئێمە بەختەوەرین، ئازیزەکەم
ئێمە بەدبەختین، ئازیزەکەم  EXIL، ل ٨٠

لەم نموونەیەدا نووسەر لەیەك کاتدا هەر دوو سیفەتی (بەختەوەر و بەدبەخت) دەخاتە پاڵ ڕاناوی ئێمەوە، لەکاتێکدا ئەم دوو ئاوەڵناوە لە زمانی خۆکاردا پارادۆکسی یەکترین.

بیست ساڵ بەسەر حەوت ساڵیمدا ڕابورد:
.
.
.
نەمتوانی تۆزقاڵێك چییە
گەورە ببم.  EXIL، ل ٢٠

لەم نموونەیەدا نووسەر دوای ئەوەی کە بیست ساڵ بەسەر منداڵیدا تێدەپەڕێ، دەڵێ تۆزقاڵێکیش گەورەنەبووم. بەمەش پاڕادۆکسێك لەنێوان ڕستەی یەکەم و دووەمدا هەیە.

هەندێ نموونەی تر:

* من هەر ڕۆژەی *نەختێك دەمرم*.  Exil، ل ١٦
بیر لە *زمانی لاڵی جوانی*  Exil، ل ٣٠
کە *دەست دەدەیتە گلازە وێسکییەك*، *وێسکی نیە*:  Exil، ل ٤٤
کە *دەست دەدەیتە گلازە شەرابێك*، *شەراب نییە*: خوێنە  Exil، ل ٤٤
* من بیر لە گوڵدانی بانێژەکان دەکەمەوە
* *دووبارە و دووبارە گیانسپاردن*.  Exil، ل ٧٠

* *هیچیان نەماون تێیاندا نەمرم.* Exil، ل ٧٦

* گەر بە *هەناسەی* غەیری تۆوەش دەژیم ئەمێستا
*هەناسە نییە* Exil، ل ٧٦

* *ئەی برادەرە شەهیدەکەم* Exil، ل ٩٠

* وەك من تۆش، *لەناو قەبر*
*بکە لە برادەرانی* بە دەرد دڵئەنجراوی ئێرە *تکا* :
*ئەوانیش* با چیتر *نەڕۆن*، *پێمان دانەبەستن پرسە*! Exil، ل ٩٠

* *پێیان بڵێ* Exil، ل ٩١

**٣-١-١-٧- بەرووەککردن**

ئەم لادانە ٣٠ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٧,٢١٪ ی هەموو لادانە واتاییەکان.
سەیری ئەم نموونەیە بکەن:

بۆنەکان هەڵوەرین. سەوزایی گرد و تەپۆلکەکان لەناو چاوما کاڵ بوونەوە.
EXIL،ل ٦

لەم نموونەیەدا سیفەتی (گەڵای)رووەك دراوەتە پاڵ بۆن.
زەردیی درەختی بەر پەنجەرەم گەڵایەکی لێوە پشکوت EXIL ل ٦٧
پشکوتنی گەڵا لە تایبەتمەندییەکانی رووەکە، بەڵام لێرەدا دراوەتە پاڵ زەردی درەختەوە بەمەش بەرووەککردن رووی داوە.

* تەبای چەند پەیڤێکی *قاچ و قوڵ گیایی*، لە کەسکایی هێمنی کێڵگەکاندا دەلەوەڕان.
Exil، ل ٥

*ماڵ:*
کە *درەختێکی* ماندووی چڵۆو پۆپ لە مل یەکتریی ڕەنگاو ڕەنگ بوو.
Exil، ل ١١

وەك گەڵایەکی زەردی وەریوی دەم با

دەخولێمەوە

Exil، ل ١٣

لە بیرمان کرد، نەمانزانی: تۆ چاوە تەبای دوو چەپکە نێرگز زەردەکانت،

Exil، ل ١٧

* بۆ بۆنە هەڵوەریوە کەوتووەکانی دەوری کانیلە سووتاوەکان Exil، ل ٤٨

* خۆشەویستییە کۆنەکانیش تەنیا چەند گوڵە فرمێسکێکی زەرد.

Exil، ل ٤٩

* عیشقی پاکیان چەند تنۆکێ سپیاتیی لینج بوو

لە پاڵ وەهمێکی ڕاکێشاوی ڕووباریندا هەڵوەری، تکا. . Exil، ل ٥٦

* نەرمایی لێوە هەنجیرییەکانت، ڕووناکیی پێنج پەنجە پەمبە پاکیزەکانت،

مهری چاوە دوو فرمێسکی گەورە ئاسا شینەکانت، ئاسوودەییت، وەفات. .

وەك بوونێکی پڕ چنگ، گەرم، بە دەستەکانی من بسپێرە:

بۆ ئەوەی لە دوور، لە سەرزەمینێکی هەمیشە پاك، لە باخچەیەکی جاویداندا بیانڕوێنم.

Exil، ل ٦٥

* دەستیش پەنجەکانی

سیسەنبەر ئاسا سیس هەڵگەڕا،

Exil، ل ٦٧

* دوورییەك، پەرجوویەك، واتایەکی لاولاوەیی چڕ دەردەکا.

کە لە چاوە گیاییەکانت ورد دەبمەوە، وەك ئەوەیە لە سەرابێك نزیك ببمەوە.

Exil، ل ٦٩

* وشە خەونییە سەوزەکانمان چۆن لەسەر لێوە لەهۆشخۆچووە مۆرەکانماندا

سیسەنبەر ئاسا سیس هەڵدەگەڕێن! Exil، ل ٦٩

* من و تۆ لە کەنار زەردایی ڕووبارێك ڕووابووین.

تۆ گوڵێکی یاسەمەن بووی، منیش لاسك. Exil، ل ٧٤

* پێش ئەوەی بێم <u>*گوڵی ڕۆحمت*</u> بۆ دەستەچن کەم — Exil، ل ٨٠

* کە تێیاندا هەر پیاسەیەك سەفەرێکە و هەر <u>*گوڵە ماچێك*</u> ئەستێرەیەك.

Exil، ل ٨٢

* ئیزرائیل ئاسا: چاوەڕێیە، <u>*وەك وشیە ترێیەکی سپی*</u>، <u>*دڵم*</u> لێ بکاتەوە. — Exil، ل ٨٢

* <u>*درەختێکی وشکم*</u> <u>*من*</u> لێرە — Exil، ل ٨٨

هێلکاریی ژمارە -٦ -

ڕێژەی بەکارهێنانی لادانە واتاییەکان لە دیوانی Exilی فەرهاد پیرباڵ

## ٣-١-٢- لادانی لێکسیکی

ئەم لادانە ٤٢ جار کە دەکاتە ٨,٥٥٪ بەکارهاتوون.

### ٣-١-٢-١- لادانی لێکسیکیی داڕێژراو

ئەم لادانە ٣٠ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ڕێژەی ٧١,٤٢٪ ی هەموو لادانە لێکسیکییەکان. بڕوانە ئەم نموونەیە:

وەك ئاوازێك، لەسەر گردە تریفەییە ئاپوورەکاندا، هەڵبەز هەڵبەز، دەلەنجایەوە.
EXIL، ل٥

لەم نموونەیەدا نووسەر بەپێی یاسای مۆرفۆلۆژی (ناو+ی) لە زمانی کوردیدا و بە لادان لە سنووردارێتی ئەم یاسایە وشەی (تریفەیی) ی دروست کردووە.

هەروەها

لە ژوورە تەنیا و دەربەدەرە پیرەکانیشدا، لە چوارچێوەیەکی دیوارین دا: دیل.
EXIL، ل ٦

لەم نموونەیەشدا شاعیر بەپێی یاسای مۆرفۆلۆژی (ناو+ین) لە زمانی کوردیدا و بە لادان لە سنووردارێتی یاساکە وشەی (دیوارین) ی دروست کردووە.

هەندێ نموونەی تر:

بەهەشتین خۆشە... EXIL، ل٩

تریفەیی EXIL، ل١٥

ئاوازیی EXIL، ل١٦

* پەنیراوی Exil، ل ٢٢

* مێشوولەیی Exil، ل ٢٢

* شەپۆلاویی Exil، ل ٣٢

* باخچەیی Exil، ل ٣٢

* ئەستێرەیی Exil، ل ٣٢

* بەهشتیانە Exil، ل ٣٣

* حەژمەتاویی Exil، ل ٣٤

* ئاوریشمین Exil، ل ٣٨

* ئەنلێشەیی Exil، ل ٣٨

* ئاوریشمین Exil، ل ٤٠
* شەهوەتاویی Exil، ل ٤٧
* ئەندێشاوی Exil، ل ٤٨
* سەمایی Exil، ل ٤٩
* هەتاوی Exil، ل ٤٩
* شەهوەتاوی Exil، ل ٥٧
* لافاوی Exil، ل ٦٥
* هەنجیری Exil، ل ٦٥
* لاولاوەیی Exil، ل ٦٩
*خەونی Exil، ل ٦٩
* جۆلانەیی Exil، ل ٧٧
* باوەشی Exil، ل ٧٧
* ماچی Exil، ل ٨٢
* باوەشی Exil، ل ٨٢
* چیمەنتۆیی Exil، ل ٨٢
* تاڤگەیین Exil، ل ٨٨

**٣-١-٢-٢- لادانی لێکسیکیی لێکدراو**

ئەم لادانە ١٢ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە رێژەی ٢٨,٥٧٪ ی هەموو لادانە لێکسیکییەکان. بۆنموونە:

لە ئێوارەیەکی ماندووی شەختەگرتووی ساڵدا، شکام EXIL،ل ٧٤

لەم نموونەیەدا شاعیر بەپێی یاسای مۆرفۆلۆژیی (ناو+ئاوەڵناوی کراو) لە زمانی کوردیدا و بە لادان لە سنووردارێتی یاساکە وشەی (شەختەگرتوو) ی دروست کردووە.

که تێیاندا هەر پیاسەیەك سەفەرێکە و هەر گوڵە ماچێك ئەستێرەیەك.

EXIL،ل ٨٢

لەم نموونەیەشدا شاعیر بەپێی یاسای مۆرفۆلۆژیی (ناو+ناوگر+ناو) لە زمانی کوردیدا و بە لادان لە سنووردارێتی یاساکە وشەی (گوڵەماچ) ی دروست کردووە.

هەندێ وونەی تر:

* *حەسرەتبار* Exil، ل ١١

* *مەرگەساتاویی* Exil، ل

* *سەعات چواران* Exil، ل ٢٤

* ( *گابەستنەوان* Exil، ل ٢٨

* *تریفەدار* Exil، ل ٢٥

* *گوند گەیشتنان* Exil، ل ٣٤

*گوڵە فرمێسك* EXIL، ل ٤٩

*ماتەمینپۆش* EXIL، ل ٦١

*سەما ڕەشە* EXIL، ل ٦٣

* *فریشتەزادە* Exil، ل ٨٢

هێلکاریی ژماره -٧-

ڕێژەی بەکارهێنانی لادانە لێکسیکییەکان لە دیوانی Exilی فەرهاد پیرباڵ

**٣-١-٣- لادانی نووسینی**

ئەم لادانە ٣٣ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٦,٧٢٪ . بڕوانە:

بە دوو چاوی بەستراوەوە زانیم: لە ئەنجامدا هەموو شتێکمان، لێ
ویران دەکرێ . .

و . . ێ .

ر . .        ا . .        ن . .

د . . ه . .        ك . .

ر . .

. . ێ . .

٧ ٨ ٩ ١        EXIL،ل ٦

لێرەدا نووسەر هەوڵی داوە لە رێگەی تێکشکاندنی شێوازی نووسینی ئاساییەوە و
ە بەربڵاوکردنەوەی پیتەکانی کاری (وێران دەکرێ) وە وێنەیەکی وێران کردنمان پێشان
دات، بەمەش لادانی نووسینی دروست کردووە. یان سەیری ئەم نموونەیە بکەن:

ئێمە دەنگمان چرپاندە دڵی هەرچی پەڵکەگیا و پۆلە هەورێك
ئەوەندەی نەبرد
یەك
یەك
هەڵ
وە
ر
یـ
ن
.
.
.
.
.
.
.

EXIL، ل ١٧

لەم دەقەشدا چۆنیەتی دانانی پیتەکان وێنەیەکی هەڵوەرینی گەڵای رووەکمان
پێشان دەدەن، ئەمەش لەرێگەی لادان لە نووسینی ئاساییەوە، بەم جۆرە لادانی
نووسینی رووی داوە.

هەندێ لادانی تر:

* ئاخ! من تاکو ئێستاش مێشکم پڕی زرنگەی زەنگییانەیی زەنگی ئەو تەلەفۆنە میهرەبانەیە، کە لەناکاو
زرنگ
زرنگ
دەزرنگایەوە
Exil، ل ٦

بە دوو چاوی بەستراوەوە زانیم: لە ئەنجامدا هەموو شتێکمان، لێ
ویران دەکرێ. .
و. . ێ. .
ر. . ا. . ن. .
د. . ە. . ك. .
ر. .
. . ێ. . .
٧ ٨ ٩ ١
Exil، ل ٦

دەچێ لەسەر گۆڕێکی بچکۆڵەی بە قەد تەنیا کیسە ئێسقانێك
دادەنیشێ و تێر تێر
د
ە
گ
ر
ی
Exil، ل ٧

* سەردەمانێك، لە حەوشەکەمان، دار پرتەقاڵێکم هەبوو،
سەربان، نیوەشەو بەدیار ئاسمانەوە: کاروان کوژە و حەوت براڵە،
گۆڕەپانە ئارەقکردووە رەنگینەکانیشدا: تۆپێك.
دار پرتقاڵەکەم بڕایەوە
کاروان کوژەو حەوت براڵەشم
لە کازیوەیەکی سێزدە ساڵیمدا ئاوابوون و نەمبینینەوە
تۆپەکەشم لێ
سەندرایەوە.

Exil، ل ٩

*

سەردەمانێك، لە زستانە ساردەکاندا، پاڵتۆیەکی گەرمم هەبوو،
گەڕەکە پیرەکەشماندا: چەند هاوڕێیەك،
شەقامە ڕاکردووە شێتەکانیشدا: چاپخانەیە
پاڵتۆکەم لێ
ناو شاخان
ڕزایەوە.
هاوڕێکانیشم هەر لە ساڵی هەشتاوە
یەك
یەك
ئاوابوون یانیش کوژانەوە.
چاپخانەکەشم لێ
ڕما

Exil، ل ٩

* بەڵام ئاخ، ئەو گەنجە کۆکە
هەر بە یەکجاری رۆیی
تازە چیتر نایبینمەوە
نا. . یـ. . بیـ. . نـ. . مە. . وە. .
Exil، ل ١٢

*
لیّ
بە
جیّ
ما:
Exil، ل ١٣

* بەختەوەری، وەك کچۆڵەیەکی شان و مل ڕووت
قژ فرمێسکاوی
لە کونجێکی ژوورەکەمدا هەڵکورماوە، هۆن هۆن دەگری:
بیّ ئەوەی پیّم بڵیّ بۆچی، بیّ ئەوەی وەڵامم بداتەوە.
لەبەر پەنجەرەکەم
تەبای
غەمێك
ڕاوەس
تا
و
م
گویّ بۆ ئاوازی بەفر شل دەکەم.

Exil، ل ١٤

*

بەفر ئاوازی، چرپە چرپی ئەوینی خۆمانم بیردێنێتەوە:
ئەو چەرپە چرپە نارنجییانەی کە دەتگوت نرکە و ئاویلکەدانی
پۆلە پۆڕێکی ڕەنگاو ڕەنگ بوون
نەگەیشتنە سەر شینکاوێکی دیکە و

ك

دەتگوت ڕەوە مامزێك بوون و
دەکرووزانەوە ژ
لە ترسی ئەمرۆ. ر
تۆ تەماشاکە، ئازیزەکەم، ا
چ بەفرێکی ئەستوورە دەبارێ! ن

.

چ من، چ تۆش چاومان لێیە: .

Exil، ل ١٤

* بەو هەموو میهرەبانییەی خۆیەوە، لە پەنا دیواری گەراجێکدا، بە دڵێکی خاڵی لە سۆز:
خوا. . حا. . فیز. . .

Exil، ل ١٥

* لە لووتکەی خۆشی و لەززەتەکاندا، لە باوەش یەکتر، کە خەریکن ببین بەیەك:
لە یەکتری
جیا
دەبینەوە.

Exil، ل ١٦

*

ئێمە دەنگمان چرپاندە دڵی هەرچی پەڵکەگیا و پۆلە هەورێك

ئەوەندەی نەبرد

یەك

یەك

هەڵ

وە

ر

یـ

ن

.

.

.

.

.

.

.

.

Exil، ل ١٧

* ژێ زیوینە زامدارەکانی گیتارەکەم

هۆن هۆن دەگرین، دەناڵێنن:

ئاسوودەیی لە دنیا نیە

ئاسوودەیی

لە دنیا

نیە

.

.

Exil، ل ١٩

* ئەو مەنزلگایەی ساڵەهای ساڵ خوێنمان بۆی دەڕشت، پێی گەیشتین:

ئێمە هەموو شتێکمان لە دەست دا

هەموو شتێکمان دۆڕاند

تەنانەت دایك، دایکی بێکەس

کە هۆن هۆن فرمێسکی هەڵدەڕشت و دەپاڕایەوە

بەجێمان هێشت!

Exil، ل ٢١

* تەنانەت پەنجەرە، پەرنجەرەی بەستەزمان

کە پردێك بوو لە نێوان ئێمە و خەون

ئێمە و بەهار

Exil، ل ٢١

* . . . لە کارگەکاندا نامیلکە و بەیانی نهێنیمان بڵاوکردەوە، لە شەقامەکاندا هاوارمان کرد:

هاوار ه ا و ا ر

Exil، ل ٢٢

*

ئا

خ

!

من لە وڵاتێکی دووری دێریندا کە وێنەکانیم لەناو ئەلبوومی یادگارەکانم پاراستووە Exil، ل ٢٤

*

Exil، ل ٢٩

*

کچە کەزی شۆڕ و خەزێم شۆڕ و بەژن شۆڕە دەشتەکییەکانی بانە و شارەزوور
پارکی و ڕووتیی قەراغ زێیەکانی خۆیان پێچایەوە و
تاک تاک
جووت و جووت
بە هەڵداوان

لەسەر لووتکەی شاخانەوە خۆیان هەڵداویشتە بەندەن و دۆڵ و خەردندانەوە.

Exil، ل ٢٩

*

هاورێ ڕۆژنامەنووسەکەم، لە ژوورەکەیدا، لێی بۆتە خوو:
بەدیار نەخشەی گەورەی کوردستانەوە دادەنیشێت
هەر جارەی سانتیمەترێکی لێ زیاد یان کەم دەکاتەوە،
لە بارەگای کۆبوونەوەی ئەزموونە ڕەنگ زەرد، چەکدارەکانیشدا:
ئیمزا و
سەنەد و
ڕێککەوتنەکان
دانیشتوون بەدیار تاجی سەری مقەببایی خۆیانەوە
د.ە. .
گ. .
ر. .
یـ. .
ن. .
ئاه
. .
.
من بیر لە گوڵدانی بانیژەکان دەکەمەوە

Exil، ل ٣٠

* زەردی و غەمگینیی سیمای پێم دەڵێ:
هەموو شتێك لە وڵاتەکەتدا وێران کراوە
و. .			ێـ. .
ر. .		ا. .		ن. .
ك. .		ر. .
ا. .
و. .
ه. .
١
٩
٨
٨

Exil، ل ٣١

* ئێوارەیەکی خۆشی ئاوها بوو
کە ڕامانی بە تاسووقم
لە
ئاخڵەی
جوانی،
خەفەت،
برسێتی،
وایان لێ کردم وردە وردە شانە هەڵگرتن، خۆشوشتن، قەرەوێت بەستن. . لەبیر بکەم.

Exil، ل ٣٣

*

ناسرِ پردێك و بوو لە نێوان پەنجەرە و کۆڵان،
بێدەنگی و هاوار،
کۆیلایەتی و ڕاچڵەکینی ڕۆح.

Exil، ل ٣٤

*

دانیشتووم بە دیار
چەند ڕەسمێکی یازدە ساڵ پێش ئەمڕۆوە
د
ە
گ
ر
ی
م
.
.
.
.

Exil، ل ٣٧

*

هاوڕێکانم!

ماوەی نێوانمان: باخچەیەك بوو؛ هەڵپڕووکا

هە. .

ڵ. .

پ. .

ڕ. .                    وو. .

ك. .          ا. .

Exil، ل ٤٢

*

حەز و هەوەس و خۆشەویستی

شەو و ڕۆژ بێدار

ڕ

وو

ب

ا

ر

ی

س

ێ

ن

ە

وەك پێلی هەوەس بەناو پاریسدا شەپۆڵ دەدا. .

Exil، ل ٥٨

*

ئەی بیرەوەرییە پڕ دڵۆپەی باران

تکـ

تکـ

بەسەر

شان و ملی دەربەدەریم: دڵنەوازەکان!

Exil، ل ٦٢

*

خلوود

خلوود ، خلوود

خلوود

خلوود

خلوود ، خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

خلوود

.. خ ل وخلوود،و د...

Exil، ل٦٦

* ساتە پەمبەر بۆنخۆشەکانیان
یەك
یەك
هەڵ
وە
ر
ا
ن
.
.
.

Exil، ل ٦٧

* من و تۆ
کە لە یەکتری جیابووینەوە
(جوانی) تەنیا مایەوە.

من
هەرچی شار و
گوند و
هەرچی باخچە و گەڕەک و
ڕەزو کۆڵان و
هەرچی منداڵ و ڕووبار و شەقام و
مێردمنداڵ و ئەستێرەیەکی پەنجەرەیەکی
کوڕ و کچ و قەیرەکچ و ژنێکی شۆخی... خۆشم ویستن؛
ئاخ
گەردەلوولێکی
ئەژدەنگی خوێنین
هەڵی لووشین،

* پێیان بڵێن: ئاسوودەیی
وك بەروار و ناوی لەسەر خۆڵ نووسراو وایە
ڕەشەبا دێت و لەگەڵ خۆیدا ڕایدەپێچێ
ڕ. . ا. . یـ. . د. . ە. . پـ. . ێـ. . چ. . ێ. .

Exil، ل ٧٧

هێڵکاری ژمارە -٨-

ڕێژەی بەکارهێنانی هەر سێ لادان لە دیوانی Exilی فەرهاد پیرباڵ

## ٣-٢- لادانەکان لای ئەنوەر مەسیفی

### ٣-٢-١- لادانی واتایی
ئەم لادانە ٢٤٥ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٩٠,٧٤٪ ی کۆی گشتی لادانەکان.

### ٣-٢-١-١- بەمرۆڤکردن
بەمرۆڤکردن ١١٢ جار بینراوە کە دەکاتە ٤٥,٧١٪ ی هەموو لادانە واتاییەکان.
بروانە ئەم نموونانە:

شەو بۆی ناکرێ
مارەیی خۆی
لەقوولایی من هەڵنجێ

شین، ل ٢٧

لەم نموونەیەدا شاعیر مارەیی کە تایبەتە بەمرۆ، خستوویەتییە پاڵ شەو و بەمەش وەکو مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵ شەو کردووە. هەروەها لەم نموونەیەی خوارەوەدا:

چەند رووبار و کۆتر هەیە
پێ دەکەنین

شین، ل ٣٣

لەم نموونەیەدا پێکەنین، کە تایبەتە بەمرۆڤ، دراوەتە پاڵ هەریەکە لە رووبار و کۆتر. بەمەش بەمرڤکردن رووی داوە.
هەندێ نموونەی تر:
<u>*تۆڵەی*</u> ساڵەکانی. .

لە ئۆقیانوسی رابواردن،

بسێنمەوە — شین، ل٢٥

زەردەپەڕی لێوی ئاسمانە

لە ئامێزی کۆچ کردندا ئەیکرد گریان — شین، ل٢٦

لایە لایەی شەوی نوێیان

ئەدایە دەست

ئەو گۆرانییەی

وێڵە بە دوای هاتنەدی شار — شین، ل٢٦

* خۆشەویستیم

لە گەردنی هەزاران کێو

تیشکی رۆژی هەڵمژیوە — شین، ل٢٧

* لەگەڵ خۆشەویستیت بلوێم — شین، ل٢٧

* بووم بە شیعر و

دەستم لە ملی گریان کرد! — شین، ل٢٧

* ئەی کزەبای دەم بەیانی

چاوەڕێتم

بێیت و ببەی — شین، ل٢٨

* (مەپرسن ئەو دەنگە کێیە — شین، ل٢٩

* وەك باڵندە

لە باوەشی کزەبای چەم گۆرانی بم

بەرەڵڵام کەن — شین، ل٢٩

* بنار و کێو لە یەك بکەن

گەڵا لە دار یاخی بکەن — شین، ل٣٠

* لە ئامێزی ئەو بترازێ — شین، ل٣٠

* داری شەکرانت نەدیوە
منم شانەی کەزیەکانی — شین، ل٣٠
* ئەی نازانی دەنگت هەیە
رووبارەکان گوێت لێ دەگرن؟!
هەورە مۆنەکان تاو دەم
ورێنەی راوی گریانم — شین، ل٣١
* بێدەنگی
گوڵی بەرۆکی
هیواکانت دەوەرێنێ
دەجۆڵلانەبە و گاگۆلەی ئاو بژینە — شین، ل٣٢
* مەمکی بەفر چرۆ بێنی — شین، ل٣٢
* رێژنەی هەتاوێ دەبینم
دەگەڕێ لە بستە خاکێ
ماچی داتێ
لە ئەستێرەیێ دەگەڕێ
ماچی داتێ
ماچم داتێ؟! — شین، ل٣٣
* گوێم لێیە بای سەرکەشی چیا
گۆرانی بۆ ئاسمان دەڵێ:
مشتێ خۆر نییە — شین، ل٣٣
* گوێم لێیە چەم
دەگرییێ بۆ ئەستێرەیەك
گڵ و بەرد بۆ هەناسەیەك — شین، ل٣٣
* بۆ هەرکۆترێ بگێڕمەوە

بالْ دەگریێت و **لە هەر رووباریٚ بپرسم** — شین، ل٣٣

* **کۆترەکان** خۆ من تا پڕ نیم

من شاعیری ئەو **هۆنراوەم**

کە **سەرچۆپیی** شاییتان **بوو** — شین، ل٣٣

* **هۆنراوەکەم**

هەندیٚ جار **مەمکی دەدایە خۆرباران** و — شین، ل٣٣

* چەند **رووبار** و **کۆتر** هەیە **بۆی دەگریان** — شین، ل٣٣

* گەر **فرۆکە** لە ئاسمانی

گوندەکەمان **بڕشێتەوە**

نامریٚنی . . **بەستەی رووبار** و،

**ئەستێرەی** گوندەکەمان — شین، ل٣٥

* (**ئەی** ئەو **جۆگەلەی** کە بووی بە،

**مەمکی شاگولی** باوەڕم — شین، ل٣٥

* **با-م دی خەریکی کەپریٚ بوو** — شین، ل٤٢

* **مێرووله‌یه‌ک**یشم بینی **قولابی** لە دڵی چیابیٚ گیرکردبوو

**لێم پرسی**، بۆ هێندە ماندووی؟

**گوتی**: ئەم چیایە دەبینی؟

نیشتمانی لیٚ ون کردووم. — شین، ل٤٢

* ئەوساش **مەمکی شەوە رەنییە بەفرەکانیان** پیٚ داغ ناکریٚ — شین، ل٤٣

* **شیعریش لە سێدارە بدریٚ** بۆنی رۆحی خاکی لیٚ دیٚ. — شین، ل٤٦

* یا شوونهەڵگریٚ بتوانیٚ **پێخوستی مێژوو** ببینیٚ، — شین، ل٤٧

* لە **گۆڕانییەکانی ئاو** بگا،

لە **گۆڕانییەکانی با** بگا، — شین، ل٤٨

* **رووبارێکی خوودار** دەکشیٚ — شین، ل٤٨

* مەلەكان ماڵییان تێك ناوە. شین، ل٤٩

* شیعرێ پێ لە دڵم دەنێ. شین، ل٤٩

* دیوارەكان دەمبەستنەوە. شین، ل٤٩

* یەكەم ڕەزێ ترێ و مێوژی بردەوە.
دووەمیشیان بە دەست بەتاڵی گەڕایەوە. شین، ل٥٠

* هەموویان یەكیان نەگرتووە.
تفەنگ، سیاسەت، تۆپ، فڕۆكە، ژەهر، درۆ. شین، ل٥٢

* لە مەل بپرسن، لە دار بپرسن، لە بەر
بپرسن، لە گیا بپرسن: شین، ل٥٣

* لە من بپرسن لە با - بپرسن شین، ل٥٣

* وەك ڕووباریش گوێم لە گۆرانییەكانی داروبار دەبوو. شین، ل٥٤

* شەوێ، دەنكە شقارتەیێ لێم گیف بووەوە و شین، ل٥٤

* بە بارانی زستانەم گوت: چەند كانیت شێلو كردووە؟
بە با -م گوت: چەند داری پیرت قەپاندووە؟ شین، ل٥٦

* باران گوتی: بەستە بزرەكان دەزانن.
با گوتی: گوێ لە لاوكی زۆمەكان بگرە. شین، ل٥٦

* درەختەكانی وەك سۆفی حەی حەی دەكەن شین، ل٥٦

* ئێواران، وڵاتێ منداڵە و دەگەڕێ لە كەپر و جۆلانە. شین، ل٥٦

* دەستی ناوەتە كەمەری كیژە لە مەچیترێكی دادەگرم.
گۆرانییەكانی دارێ شەكرانێ و با-ی وانیێ بۆ دەڵێ. شین، ل٥٧

* گوێم لە حەی حەی دارەكانە.
ئەوانیش لەگەڵ كوڕەكەم خەڵوەتكێشی داوەتێ
لەمە چێترن. شین، ل٥٧

* جۆگەكانی ئاوزینگ دەدەن.

*فانۆسەکانی* *مان دەگرن.*
*گردەکانی* وەکو سۆفی *حەی حەی دەکەن.*
*گۆڕەکان* *دڵیان دامەوە.*
*مەلەکان* *دڵیان دامەوە.*
*گوندەکان* *دڵیان دامەوە*، هەتا دوایی. شین، ل٥٨
* ئاخر کوڕم یەکەجار *مانگ* لەوێ *داوەتی بۆ کرا.* شین، ل٥٨
* *تارمایێ* *گۆرانییان دەڵێ* شین، ل٦٠
* *ئاوەکانیش* کە دەیانگەمێ *پێ دەگرن.*
عەیامەکە *گوێ* لە *سەربردەی* *خاك دەگرم.* شین، ل٦٠
* لە وەلی نەدەچووم، بەڵام کە *دارەکان* لەگەڵ من *حەی حەیان دەکرد*
شین، ل٦٠
* مەلەکان کە *ڕووی* *مانگیان* دی، شین، ل٦١
* *سێبەریشم* *وەکو* *دایکێ* لەو وڵاتانەی کە شین، ل٦١
* من نیم ئەوەی ئەم *گۆرانییانەت* *بۆ دەڵێ.*
چەند *هێلانەی* تیك دراون.
*بلقەکانی* چەند کانییەکی چۆڵ و هۆڵن،
*پردی* رووخاوی سەرەڕێن،
*مزگەفتی* تالان کراون شین، ل٦١
* ئەمشۆش دەبێ *پرچی* *شتی* *بێ گیان* دابێنی، تا دەنووی. شین، ل٦٢

### ٣-٢-١-٢- بەتەنکردن

بەڵام ئەم لادانە بەرێژەی ٤٣ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ١٧,٥٥٪ ی کۆی گشتی لادانی واتایی. بڕوانە ئەم نموونانە:

که خەون و ژان
بوو بە ئەڵقەی دڵداریما　　　　شین، ل ٢٦

لێرەدا سیمای واتایی [+تەن] دراوە بە خەون و ژان  کە لە بەکارهێنانی ئاساییدا سیمای واتایی [- تەن]ی هەیە. ئەمیش لە رێگە چواندنیان بە ئەڵقە کە لە بەکارهێنانی ئاساییدا سیمای واتایی [+ تەن]ی هەیە.

من چیام. . من چیام
هەزار مێردم
شانەدەر　　　　شین، ل ٣١

لەم دەقەدا شاعیر سیمای [+ تەن] ی داوە بە راناوی (من) ئەویش لە رێگەی چواندنی بە (چیا، هەزار مێردم و شانەدەر) ەوە کە لە زمانی خۆکاردا سیمای واتایی [+ تەن] هەیە.

هەندێ نموونەی تر:
داری شەکرانت نەدیوە
منم *شانەی* کەزیەکانی
چەمی سیروانت نەدیوە

* *ئازار ئەرزن*　　　　شین، ل٢٦
* (مەپرسن ئەو دەنگە کێیە
*گڵ* و *بەردە*
*پووش* و گیانە)　　　　شین، ل٢٩
*منم گڵ* و *بەرد* و ئاوی　　　　شین، ل٣٠

| | |
|---|---|
| گڵ و بەردەم . . پووش و گیامە | شین، ل٣١ |
| ئاوبم . . کێڵ بم | |
| بۆ رووباری نقووم بوو تا | شین، ل٣١ |
| * دڵی لێ دەبتە ئەستێرە | شین، ل٣٢ |
| * دەجۆڵلانەبە و گاگۆڵەی ئاو بژینە | |
| جوڵلانەبە و | شین، ل٣٢ |
| * دەبە بووکۆکەی منداڵی | شین، ل٣٤ |
| * دڵی خۆم دەکردە خاك و توند بە دڵت وەدەنووسام | شین، ل٤٢ |
| * گەورەتر بوومایە، چاوی خۆم دەکردە گڵۆپ و | |
| چیتر نەمدەهێشت شەوغوونیی شارەکەم بۆنی | |
| تاریکیی لێ بێ. | |
| گەورەتر بوومایە، لەپی خۆم | |
| دەکردە تەختەرەشە و نەمدەهێشت چیتر | |
| دیواری قوتابخانەی گوندەکەم بۆنی ترسی لێ بێ. | شین، ل٤٤ |
| * هەتا دووری نەبتە داوە دەزوو، نەپسێ، | شین، ل٤٥ |
| * لە ناو کاتی گوندت نوستووە. | شین، ل٤٥ |
| * جاران چاوت بۆ من دوو پەنگری گەش بوون | شین، ل٤٥ |
| * یاخۆ بەرماڵی ماڵێ بام، | شین، ل٤٦ |
| * کێ ڕەشماری بۆ هەڵدایت و دڵی لێ کردووی بە کوانوو؟! | شین، ل٤٦ |
| * شەوان هەرچی سووە وەکو فانۆس دیارن | شین، ل٤٨ |
| * گوندی بیری ژەنگی گرتووە. | شین، ل٤٩ |
| * دووکەڵی جغارەت هەر لە حەمرین دەچێ. | شین، ل٤٩ |
| * سەرەتایەکی تر ئێشی کردوومەتە بەر بەرۆچکە | شین، ل٥١ |
| * لێکدان و دەرکردن بوو. دڵیشم لێ بووە مزگەفت. | شین، ل٥٢ |

* یان ببم بە گورزی ڕۆستەم.
یان شتێکی وکو زولفەقاری عەلی — شین، ل٥٢
* منیش مێژووم، هێشتا ئێشم لە دوو دەخشێ. — شین، ل٥٢
* وەك بەلەمێکی بچکۆڵە لە ڕۆخ بەستی بەجێ ماوە. — شین، ل٥٦
* زۆم و پاوانی کۆچەرم،
کوچکەبەرد و چیلە و چەمی گوندەکەمم، — شین، ل٥٧
* لێ ناگەڕێ بە بەژنی چیا هەڵبگەڕێم. — شین، ل٦٠
* دڵم وەکو تورەکەیەکی پڕ بەردە. — شین، ل٦٠
* لە بڵندترین قۆپی سوو بام لێ بدا — شین، ل٦١
* تۆ شاخی ترۆپکت هەر ماوە — شین، ل٦٢

### ٣-٢-١-٣- بەئەبستڕاکتکردن

هەروەها ئەم لادانە ١٢ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٤,٨٩٪ ی کۆی گشتی لادانی واتایی. بڕوانە ئەم نموونەیە:

تۆ نساری من بەفرتم
تۆ دیوانی من شیعرتم

شین، ل ٢٧

لەم دەقەدا ڕاناوی جارێك بە نسار و جارێکی تر بە دیوان و ڕاناوی من ی بە شیعر چواندووە کە هەر سێکیان لە بەکارهێنانی ئاساییدا سیمای واتایی [+ئەبستڕاکت]ی هەیە.

وڕێنەی ڕاوی گریانم — شین، ل ٣١

لیێرەدا راناوی (من) کە دەرنەکەوتووە و راناوی (م) شوێنگرەوەیەتی چوێنراوە بە (وڕێنە) کە سیمای واتایی [+ ئەبستراکت]ی هەیە.

* گیانە هێشتا ئارامی تۆم — شین، ل٢٧

* بووم بە شیعر و — شین، ل٢٧

* شیعرم . شیعرم — شین، ل٢٨

* ئەگەر ببی بە ئەتۆم — شین، ل٣٤

بیکەنەوە، منم خەونی مێژووی مرۆڤ. — شین، ل٥٢

منیش مێژووم، هێشتا ئێشم لە دوو دەخشێ. — شین، ل٥٣

من ئێشێکم لە ناو قوردام. — شین، ل٦١

### ٣-٢-١-٤- بەرەوانکردن:

بەڵام ئەم لادانە بەرێژەی ١٤ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٥,٧١٪ ی کۆی گشتی لادانی واتایی. بڕوانە ئەم نموونەیە:

من دەریایەکی ئەوەندە تەماوی نیم — شین، ل ٣٠

لەم نموونەیەدا راناوی من ی بە دەریا چواندووە کە لە زمانی خۆکاردا سیمای واتایی [+ رەوان]ی هەیە. یان:

من ببم بەسەر کۆماری تۆپی زەوی.

یان لافاوێکی وەکو نووح. — شین ل ٥٢

لێرەدا (من) بە لافاو چوێنراوە کە سیمای واتایی [+ رەوان]ی هەیە.

لە ئۆقیانوسی رابواردن، — شین، ل٢٥

دەریایەکم. ماسی فێرە مەلە دەکەم — شین، ل٣١

جۆگەلەمە و — شین، ل٣٥

* ئەمشەو لە خەومالە کۆتر و

دەریا دەچووم — شین، ل٣٦

* نە بە زیندیش تاڤگەی خۆراو بەسەر سنگت دێتە خوارێ. — شین، ل٤٢

* من دەمێکە لە ناو چاوما تاڤگەی خەون دێتە خوارێ

دەمێکە سییەکانم دەریان، نەهەنگە شیعری تێ دەمرن. — شین، ل٤٦

* سەرم ئاورگانی ژنە.

رووبارێکی دەربەدەرە، خۆربارانە. — شین، ل٥٧

* رووبارێکی دەربەدەرم. — شین، ل٥٧

* رووبارێکی دەربەدەرم. — شین، ل٥٧

* رووبارێکی دەربەدەرم — شین، ل٥٨

* رووبارێکی دەربەدەرم — شین، ل٥٨

### ٣-٢-١-٥- بەئاژەڵکردن:

هەروەها ئەم لادانە بەرێژەی ٢٣ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٩,٣٨٪ ی کۆی گشتی لادانی واتایی. بڕوانە ئەم نموونانە

دڵۆپەکانی وەك زەردەواڵەی ماڵانە — شین، ل٤٨

لەم نموونەیەدا دڵۆپەکان مامەڵەی زەردەواڵەیان لەگەڵدا کراوە ئەمیش جۆرێکە لە ئاژەڵ و بەمەش بەئاژەڵکردن رووی داوە.

دڵی لێ دەبتە چۆلەکە

دەبتە ماسی — شین، ل ٣٢

لێرەشدا دڵی بە چۆلەکە و ماسی داناوە ئەمانیش هەردووکیان ئاژەڵن. بەمەش دوو جار بەئاژەڵکردن رووی داوە.

هەندێ نموونەی تر:

* بۆت بخوێنم . . بجریوێنم — شین، ل٢٨

* وەك باڵندە

لە باوەشی کزەبای چەم گۆرانی بم — شین، ل٢٩

* ورێنەی راوی گریانم

دەمەوێ ئاسکی هەتاو بم — شین، ل٣١

* دڵی لێ دەبێتە چۆلەکە

دەبێتە ماسی

* زوو دەنووك لە دەنکە گەنمی بن تریان دەی — شین، ل٣٢

* بەس دەنووك لە شیعری وەردەن — شین، ل٣٣

* کلی چاوی عەشقتان بوو

شین، ل

* ئەمشەو لە خەوما لە کۆتر و

دەریا دەچووم — شین، ل٣٦

* نیشتمانی من هەڵۆیە، — شین، ل٤٢

* وەك مارێکی عاشق بەرەو کاولە خانیم — شین، ل٤٥

* سەری ڕەش دڵگیر بووی. کچێ مەگەر ئەو مرۆڤەم

لە تۆ زیاتر خۆشویستبایە کە ئێواران وەکو هەڵۆ

لە ئاسمانی کوردان دەفڕی. — شین، ل٤٥

منیش شیعرم لێ بۆتە ئاسکێکی تێنوو — شین، ل٤٦

دەمێکە سیبەکانم دەریان، ئەهەنگە شیعری تێ دەمرن. — شین، ل٤٦

کڵۆ بەفریش لەم وڵاتە هێشتا بە ئاسمانەوەیە

گڕ بەر دەداتە هاتنی خۆی.

دەڵێ نەوەك پاچێ سەرم ببڕێتەوە — شین، ل٤٧

* ئێواران ئەسپێکی سرك لە خاپوور دێتە دەرێ
هەتا خۆر دەنیشێ، شین، ل٤٨

* هەرچی قۆپە سۆڵێکی وەك هەڵۆی گرتووە. شین، ل٤٨

* لەگەڵ ئەو هەموو پۆلییانە بچریکێنم شین، ل٥٤

* وەکو کەلاکی غەریبێ شین، ل٥٦

* وەکو بایەکی بریندار هێستری چاوی کەلاکی
خۆم دەسڕیەوە. شین، ل٦٠

* کە گەرم بووینەوە، مەلەکان فڕین و منیش سێبەری
خۆم کردە کەرك و کەلاکی خۆم جێ هێشت. شین، ل٦٠

### ٣-٢-١-٦- پاڕادۆکس

بەڵام ئەم لادانە ١٥ جار بەکارهاتووە و بەمەش ئەم ژمارەیە دەکاتە ڕێژەی سەدی ٦,١٢% ی کۆی هەموو ئەولادانە واتاییانەی کەبەکارهاتوون. لەم نموونانە بڕوانە:

شەوێ لە شەوان خۆم کردە چەتە و بەرەنگاری خۆم بووم.
خۆم کوشت و سەری مردنی خۆ بۆ کۆشك هێنایەوە.

شین، ل ٤٢

لەم نموونەیەدا نووسەر دوای ئەوەی خۆی دەکوژێ سەری مردنی خۆی دێنێتەوە بۆ کۆشك. بەمەش پاڕادۆکسێك دروست دەبێ چونکە ئەو کە خۆی کوشتووە ناتوانێ سەری خۆی بێنێتە کۆشك. بەڵکو ئەم کارە تەنها بە زیندوو دەکرێ نەوەك کوژراو.

جاران چاوت بۆ من دوو پەنگری گەش بوون
شەوکرێوان پەنجەی خۆمم پێ دەتاساند.

شین، ل ٤٥

نووسەر لەم نموونەیەدا دوای ئەوەی چاوەکانی ئەوی لا دوو پەنگر بووە کەچی ئەم پەنجەی خۆی پێ دەتەسێنێ. بەمەش پارادۆکسێك لەنێوان وشەی پەنگر کە گەرمە و وشەی تەساندن کە بە هۆی ساردییەوە دەبێ دروست کردووە.

هەندێ نموونەی تر:

خۆت کردە گڕ، دەنەگیرسای. — شین، ل٤٢

خۆم کوشت و سەری مردنی خۆم بۆ کۆشك هێنایەوە.

گوتم، پاداشت؟! — شین، ل٤٢

لەسەر گۆڕی خۆم دەگریام. — شین، ل٤٢

* ماڵی خواشیان کردە پەنگر.

ئەوساش مەمکی شەوە ڕەنییە بەفرەکانیان پێ داغ ناکرێ — شین، ل٤٣

* جاران چاوت بۆ من دوو پەنگری گەش بوون

شەوکرێوان پەنجەی خۆمم پێ دەتاساند. — شین، ل٤٣

* ئەمشەو شیعرم کودێتایە.

شێتە.

تایە.

بەفرە.

بایە. — شین، ل٥١

* هێشتا لە دایك نەبووبووم

هەر لە ناو لەشی باوکەم هاتووچۆم دەکرد

غار غارانێی ئەسپ سوارەکانی مێژووم ڕەسم دەکرد.

داگیرسانی ڕۆمام دەدی.

* ئەو نۆ مانگەی لە ناو منداڵدانی دایکەم دانیشتبووم.

ڕۆمانێکی نۆ ملیۆن پەڕم خوێندەوە. — شین، ل٥٢

* نەوەك مردووەکان ببینن برینی خۆم پێشان بدەن. — شین، ل٥٣

* بەڵی لە من پرسیار بکەن: مردووەکان حەز لە
کامە گۆرانی دەکەن؟ — شین، ل٦٠

* لە خەونمدا/ چەند مردووێ ڕاویان دەنام — شین، ل٦٣

### ٣-٢-١-٧- بەرووەککردن

کەچی ئەم لادانە١٦ جار بەکارهاتووە و بەمەش ئەم ژمارەیە دەکاتە ڕێژەی سەدی ٦,٥٣٪ ی کۆی هەموو ئەولادانە واتاییەکان. بڕوانە ئەم نموونانە:

نیشتمانم گوڵەگەنمە
بە من نییە ڕەگی لەناو خوێنی دڵمە — شین، ل ٣٠

لەم نموونەیەدا شاعیر نیشتمانی بە گوڵە گەنم داناوە ڕەگی پێ داوە بەمەش مامەڵەی ڕووەکی لەگەڵ کردووە و بەرووەککردن رووی داوە. یان:

بارێ گەڵای مێژووم پێیە. — شین، ل ٢١

لەم نموونە یەشدا شاعیر یەکێك لە تایبەتییەکانی ڕووەك کە گەڵایە بەخشیویەتی بە مێژوو. بەمەش بەرووەککردن رووی داوە.

* وەك من هۆنراوە،
لە بتی تەکان ئەچنن، — شین، ل٢٦
وەك ئەستێرە
فرمێسکەکان
لە ئاقارە سووتاوەکان
شین نەبوون و گیانیان ئەگرت! — شین، ل٢٦
(مەپرسن ئەو دەنگە کێیە
گڵ و بەردە
پووش و گیانە) — شین، ل٢٩

**نیشتمانم گوڵەگەنمە**

به من نییه **ڕەگی لەناو خوێنی** دڵمه — شین، ل٣٠

* گڵ و بەردەم .. پووش و **گیامه** — شین، ل٣١

* **مەمکی بەفر چڕۆ بێنی** — شین، ل٣٢

* هەرچی **ڕەشەخەون** هەیه **خۆی کردۆته دار** و دەیەوێ منی لێ ببەستەوه. — شین، ل٥١

* باری **گەڵای مێژووم** پێیه. — شین، ل٢١

* **وەکو چیلکەیەکی** کزر گەرد و تۆزی پایزانەی هەڵگرتبێ — شین، ل٥٤

* **وەکو پەیەداری** شیعرت فڕێ دەدایه ناوی — شین، ل٥٥

* **وەکو کۆلکە مێوێ** له بن چیایێ **پەل و پۆم هاوێشتووه.** — شین، ل٦٠

هێڵکاری ژماره -٩-

ڕێژەی بەکارهێنانی لادانه واتاییەکان له دیوانی خۆرباران و جارێکی تر خۆربارانی ئەنوەر مەسیفی

**٣-٢-٢- لادانى لێكسیكی**

ئەم لادانە ٢٣ جارکە دەکاتە ٨,٥٨٪ ی کۆی هەموو لادانەکان.

**٣-٢-٢-١- لادانى لێكسیكیی داڕێژراو**

ئەم لادانە١١ جار بەکارهاتووە و بەمەش ئەم ژمارەیە دەکاتە ڕێژەی سەدی ٤٧,٨٢٪ ی کۆی هەموو لادانە لێکسیکییەکان. بڕوانە ئەم نموونەیە:

با-یەکی توند دەگڤێنێ — شین، ل ٤٨

شاعیر بەپشت بەستن بە یەکێك لە یاساکانی دروستکردنی چاووگی دروستکراو واتە (ناوی دەنگ+اندن) لە ناوی دەنگی (گڤە) و پاشگری (اندن) چاوگی گڤاندنی دروستکردووە و پاشان بۆ کەسی سێیەمی تاك لە کاتی ڕانەبردوودا گەردانی کردووە.

یان:

کۆمانە بەرەو خوارەوە شۆڕبوومەوە. — شین، ل ٦١

لەم نموونەیەدا شاعیر بەپشت بەستن بە یاسای مۆرفۆلۆژیی کوردیی (ناو+انە) ئاوەڵکاری (کۆمانە)ی دروستکردووە.

هەندێ نموونەی تر:

<u>بوێژ</u> — شین ل٢٥

<u>خانۆچکە</u> — شین ل٤٨

* <u>ڕۆژنامەگەر</u> — شین، ل٣٥

* <u>دەگڤێنێ</u> — شین، ل٤٨

* <u>خراپگە</u> — شین، ل٤٩

* <u>خراپگە</u> — شین، ل٦١

* خراپکه	شین، ل٥٧

* خراپکه	شین، ل٥٨

* خراپکه	شین، ل٥٨

* کۆمانه	شین، ل٦١

### ٣-٢-٢-٢- لادانی لێکسیکیی لێکدراو

ئەم لادانە١٢ جار بەکارهاتووە و بەمەش ئەم ژمارەیە دەکاتە ڕێژەی سەدی ٥٢,١٧٪ ی کۆی هەموو ئەولادانە لێکسیکییەکان.

که ژانه شیعر دەیگرتم	شین، ل٤٥

لێرەدا شاعیر بەپێی یاسای مۆرفۆلۆژیی کوردیی (ناو+ناوگر+ناو) وشەی لێکدراوی (ژانه شیعر)ی درووستکردووە.

ڕووبارێکی لافاوگر و خواردمیەوە.	شین، ل٥٤

لەم نموونەیەدا شاعیر بەپشت بەستن بە یاسای مۆرفۆلۆژیی کوردیی (ناو+ڕەگی کار) وشەی لێکدراوی (لافاوگر)ی درووستکردووە.

* بە فرەشەوان	شین، ل٣٤

* نه بە زیندیش تاڤگەی خۆراو بەسەر سنگت دێتە خوارێ.	شین، ل٤٢

* هەتاوەشەو	شین، ل٤٥

* شەوکرێوان	شین، ل٤٥

* شەو هاوینان	شین، ل٤٥

* ژانه شیعر	شین، ل٤٥

* نیوەڕۆ هاوینێ	شین، ل٤٥

**نەهەنگە شیعر**

* **چۆلپەرست** شین، ل٤٦
* **لافاوگر** شین، ل ٤٩
* **شەوبا** شین، ل٥٤
* **کەپرەنشینە** شین، ل٥٧
* **شەوباران** شین، ل٥٧

شین، ل٥٨

هێلکاریی ژمارە -١٠-

ڕێژەی بەکارهێنانی لادانە لێکسیکییەکان لە دیوانی خۆرباران و جارێکی تر خۆربارانی ئەنوەر مەسیفی

### ٣-٢-٣- لادانی نووسینی:

هیچ جارێکبەکار نەهاتووە.

هێلکاریی ژمارە -١١ -

ڕێژەی بەکارهێنانی هەر سێ لادان لە دیوانی خۆرباران و جارێکی تر خۆربارانی ئەنوەر مەسیفی

## ٣-٣- لادانەکان لای نەوزاد ڕەفعەت

### ٣-٣-١- لادانی واتایی

#### ٣-٣-١-١- بەمرۆڤکردن

بەمرۆڤکردن ١٤٥ جار بینراوە کە دەکاتە ٦٤,٤٤٪ ی هەموو لادانە واتاییەکان.

سەیری ئەم نموونانە بکە:

ئەم لادانە ٢٢٥ جار دووبارە بووە تەوە کە دەکاتە ڕێژەی ٧٩,٢٢ ٪.

لەپیرە هەڵۆیان پرسی: بەفری گەرم، ل٩٤

لەم نموونەیەدا پرسیار لە هەڵۆ دەکرێت بەمەش دەبێتە بەرکار بەڵام بەرکاری کاری (پرسین) لە زمانی خۆکاردا سیمای جیاکەرەوەی [+مرۆڤ] ی هەیە کەچی هەڵۆ ل زمانی خۆکاردا ئەم سیماجیاکەرەوە واتاییەی نییە و شاعیر لە شیعرەکەی خۆیدا ئە سیماجیاکەرەوە واتاییەی پێ بەخشیوە بەمەش بەمرۆڤکردن روویداوە.

تێگەیشتم چیا قسەیێکی پێیە

بۆیە ئاوا ناڵە و هاوار و فیغانی لێ هەڵدەسێت — بەفری گەرم، ل٩٧

شاعیر لەم نموونەیەدا (چیا) ی کردووە بە بکەری هەریەکە لە کارەکانی (قسە پێبوون، ناڵە لێ هەڵسان، هاوار لێ هەڵسان و فیغان لێ هەڵسان)، بەڵام بکەری هەریەکە لەم کارانە لە زمانی خۆکاردا سیمای جیاکەرەوەی واتایی [+مرۆڤ]ی هەیەن، واتە مامەڵەی مرۆڤی لەگەڵ چیادا کردووە، بەمەش بەمرۆڤکردن دروست بووە.

هەندێ نموونەی تر:

*پشتی* ئەوەندە رِقاوی

*دەستی لە ئەموك نەناوم* — بەفری گەرم، ل٩١

*لێی دەپرسم*. . . — بەفری گەرم، ل٩١

شەوی ئاوا. . .

لە پڕ لێم پەیدا دەبێت و بە ئاستەم لە دەرگا دەدات — بەفری گەرم، ل٩١

* لەوەتی *لە پەنجەی* گەفی باوبۆران و

*کۆرە* و *پرمەی* هەسپی توورەی شاخ *تێدەگەم* — بەفری گەرم، ل٩١

* *بەجل* و *ریشی* بە بەفر و بارانەوە — بەفری گەرم، ل٩١

* بە هەمان *بزەی* خەماویی جارانەوە — بەفری گەرم، ل٩١

* *خۆی بەژووره* تار و تەنگەکەمدا *دەکات* — بەفری گەرم، ل٩١

* لە کاروانسەرای ڕۆحمدا **بارگە دەخات** بەفری گەرم، ل٩١

* **وەرە ژووری** بەفری گەرم، ل٩١

* زۆرم **غەریبی دەکردیت** بەفری گەرم، ل٩١

* لەم سەردەمە نەهات و نابینایەدا بەفری گەرم، ل٩١

تەنیا تۆم **دۆست** و هاوردیت (**هاودەردیت**) بەفری گەرم، ل٩١

* **دانیشە** با پێکرا **پێکێك بخۆینەوە** بەفری گەرم، ل٩٢

* بۆ ئاوا **پیش دەخۆیتەوە** بەفری گەرم، ل٩٢

* دە **پێم بڵێ** چ ڕووی داوە؟! بەفری گەرم، ل٩٢

* **تۆ باخەوان** و **خودانی** گشت باخ و جۆگەلەکانی بەفری گەرم، ل٩٢

* ئاوا بەکوڵ **شین دەگێڕیت**؟! بەفری گەرم، ل٩٢

* ئەوەندەم **سەرنجی** تیژی پڕ تانەوتەشەر **مەدەرێ** بەفری گەرم، ل٩٢

* ئەوەندەم **تێ ڕامەمێنە** بەفری گەرم، ل٩٢

* دە **پێم بڵێ** بەفری گەرم، ل١٥٧

* بۆ **پەستیت** و بڵق بڵق ئاوت لە چاودا دەکوڵێت؟! بەفری گەرم، ل١٥٧

* **پەشیمانیت** لەو **فرمێسکە** درشتانەی کە تا دەمی بەری بەیان

بۆ گراوی و کات و شوێنێکی ئیرەمیت

**دەباراندن؟!** بەفری گەرم، ل٩٣

* تەمەنی گەنجیت بەفری گەرم، ل٩٤

* **پەشیمانیت**؟! بەفری گەرم، ل٩٤

* **پەشیمانیت** لەو تەمەنە درێژەی کە بەڕاز و داربەڕووت بەخشی؟!

بەفری گەرم، ل٩٤

* سەرت تەنیا بۆ **بەستنەوەی قەیتانی** کەوشت دانەواند؟!

بەفری گەرم، ل٩٤

* دەڵێیت ناوێرێت لای منیش **ڕازی** ناخت **بدرکێنێت**؟! بەفری گەرم، ل٩٤

| | |
|---|---|
| * دەترسیت تۆزێك بەهێماش شتێکم تێبگەیێنیت؟! | بەفری گەرم، ل٩٤ |
| * وتی" خەنیم | بەفری گەرم، ل٩٤ |
| * هۆ. . . باوکە شووری بەئەمەك | |
| قەڵای گەمارۆدراو هەر تۆزێك زەفەرت پێ ببرێت | بەفری گەرم، ل٩٥ |
| * ئەڵوەن لێڵ و خاو و بێزار ڕێگا دەگرێت | بەفری گەرم، ل٩٥ |
| * مەدوێ مەدوێ | بەفری گەرم، ل٩٦ |
| * زۆرانی نێچیر و گورگە | بەفری گەرم، ل٩٦ |
| * ناکۆکیی چەقۆ و برینە | بەفری گەرم، ل٩٦ |
| * ئەم ڕەشەبایە دزێوە. . . هەرەسە دێوەزمەیە | |
| قۆڵ و باسکی لە هەواری بێ ئەنوایان هەڵماڵیوە | بەفری گەرم، ل٩٨ |
| * داستان و ئەفسانەش شتی وایان بەخۆوە نەدیوە | بەفری گەرم، ل٩٨ |
| * ها. . . ئەم پێکە بخۆرەوە | بەفری گەرم، ل٩٨ |
| * جگەرەیەك داگیرسێنە | بەفری گەرم، ل٩٨ |
| * مەگەر ئەم نیوە پێکە یا | |
| ئەم چەند جگەرەیەی ماومن بێنە هانام | بەفری گەرم، ل٩٨ |
| * بەدەم کۆڤانی بیرکردنەوەوە دەهەژایتەوە | بەفری گەرم، ل٩٩ |
| * دەکولایتەوە و پێکت هەڵدەدا | بەفری گەرم، ل٩٩ |
| * جگەرەت بەیەك دادەگیرساند و | بەفری گەرم، ل٩٩ |
| * لەبەر خۆتەوە گۆرانیت دەچڕی | بەفری گەرم، ل٩٩ |
| * دەیان شتت بۆ پەرداخی نیوەی پێشت دەردەبڕی | بەفری گەرم، ل٩٩ |
| * چاوت سڕییەوە | بەفری گەرم، ل٩٩ |
| * لێوت هەڵقورتاند: | بەفری گەرم، ل٩٩ |
| * بانگی تووڕەییی ئاسمانە؟ | بەفری گەرم، ل١٠٠ |
| * ئەم دەهاتە هانا و فریا؟! | بەفری گەرم، ل١٠٠ |

| | |
|---|---|
| * جستەی کرژهەڵاتووی شار | بەفری گەرم، ل١٠٣ |
| * تەوێلم پێ لێکدەنێت و | بەفری گەرم، ل١٠٥ |
| * هەمیشە سیمرخی خەونم دێتە هانا | بەفری گەرم، ل١٠٨ |
| * مانگی هێژا | بەفری گەرم، ل١٠٩ |
| * تیترواسکە هاورێکەم پەیدا بووەتەوەو | بەفری گەرم، ل١١٠ |
| * ئاگام لێیە | بەفری گەرم، ل١١٠ |
| هەواڵی تازەی دیتنی یەکێکم پێ دەگەیێنێت | بەفری گەرم، ل١١٠ |
| * دەبا پێی بڵێم بزانم | بەفری گەرم، ل١١٠ |
| * ئەمجارەیان | بەفری گەرم، ل١١٠ |
| قەت هەواڵ و سۆراخێکی پیری فریادڕەس ناهێنێت! | بەفری گەرم، ل١١٠ |
| * تەنانەت مەلیش ناوێرن | بەفری گەرم، ل١١١ |
| * بڕوانە چۆن لەو دوورەوە ڕاوەستاوە! | بەفری گەرم، ل١١٤ |
| بەفیزەوە سەر هەڵدەبڕێت | بەفری گەرم، ل١١٤ |
| * نێرەبی یاخی بۆ کوێ دەچیت؟! | بەفری گەرم، ل١١٤ |
| *. . . هەستەوە لەگەڵیا دەدوێم | بەفری گەرم، ل١١٦ |
| * دەنووکی سۆز و گۆرانیم پێ لێکمەنێن | بەفری گەرم، ل١١٦ |
| * تیرم بۆ لە کەوان مەنێن | بەفری گەرم، ل١١٦ |
| * تاوێك گوێ هەڵخەن بزانن | بەفری گەرم، ل١١٦ |
| مەلی قەفەس چی دەخوێنێت! | بەفری گەرم، ل١١٦ |
| * هەتاوی پیرۆز چاو هەڵدەگلۆفێت | بەفری گەرم، ل١١٨ |
| * شەوەزەنگی ژووری و دەری | |
| بەلادا دێت | بەفری گەرم، ل١١٩ |
| * پێم بڵێت: تاقە جووتم تۆیت | بەفری گەرم، ل١٢٢ |
| * (هەمان شەقامی جارانە. . . دەڵێیت تەرمە ڕاکشاوە | بەفری گەرم، ل١٢٧ |

* ڕەنگاڵەکان کپن. . . مردوون؟!
بەفری گەرم، ل١٢٨

* هەورازە ڕێ و/
گۆشەی لاپەڕی مەیخانە و شەقامەکان
وەدەنگ بێنە/ ڕازی قەدەغەو نهێنیی
ژوورەوە و ناخ/ بە ئەستێرە و شێت و
سەرخۆشی درەنگان/ درەختەکان/ بلرکێنە/
بەفری گەرم، ل١٣١

* کالبتۆس و ڕیشۆڵەی سەریان گەواهن
بیانلوێنە/ بزانە کێ بەسەرهاتی/ سەر گوزەشتەی/
لەتاشەبەرد هەڵدەکەنێت/ تا پشتاوپشت/
دەماودەم بناسرێتەوە؟/ لەهۆش و یادی
زەماندا نەسرێتەوە؟/ بۆی دەسووتێت؟/
بەفری گەرم، ل١٣١

* لاشەی ئەم خەونە دێرینە/
بەفری گەرم، ل١٣١

* دڵم لێی دەشکێت
بەفری گەرم، ل١٣٢

* لێی بێزار دەبم
بەفری گەرم، ل١٣٢

* لێی زویر دەبم
بەفری گەرم، ل١٣٢

* لێی دادەبڕێم و سایە و میچێکی تر هەڵدەبژێرم
بەفری گەرم، ل١٣٢

* هەر نەمناسیبێت
بەفری گەرم، ل١٣٢

* بەڵام کاتێك کە داد و هاواریم دەگاتە بەرگوێ
دەقیژێنێت: ((ئای بۆ فریادڕەسێك! ))
بەفری گەرم، ل١٣٣

* لەگەڵ ڕووبار مێروو و کەڤردا
لەگەڵ خەنجەر و داس و بەفردا
هەڵدەسمە سەرپێ
بەفری گەرم، ل١٣٣

* گەردنە و لە کۆت نابووریت
بەفری گەرم، ل١٣٤

* مرۆڤ و زەمینێکی تر چاو هەڵئێنن
بەفری گەرم، ل١٣٤

* شینی بۆ باز و کانیاو و مێرخوزاری دوور گێراوه — بەفری گەرم، ل١٣٦
* کێوی بووبوو، چەمابۆوه، لێوی دەکرۆشت — بەفری گەرم، ل١٣٦
* خۆزگەی بەشتەها دەخواسست — بەفری گەرم، ل١٣٦
* لەبەرخۆیەوە داخاوت و دەیبزرکاند: — بەفری گەرم، ل١٣٦
* بارانی نیسان
خۆش خۆش دەستیان
بەسەر و پشتدا دەهێنێت — بەفری گەرم، ل١٣٩
* دارخۆخێك بام
تا بەیانی
باران دەستی لە قژ دەنام — بەفری گەرم، ل١٣٩
* سوپاس شووشە بەتاڵەکان — بەفری گەرم، ل١٤١
* لەم زەمان و رۆژگارە مشت قووچاوەدا — بەفری گەرم، ل١٤١
* نەرم نەرم. . . بەڕوومەوە پێدەکەنی — بەفری گەرم، ل١٤١
* یەکەمنبیستوومە مامز زویرن
مێگەل. . مێگەل. . سەر هەڵدەگرن
گوێی بۆ قسەو باسوخواسی
خاك و خۆڵ و گیاندارەکان هەڵخستبوو — بەفری گەرم، ل١٤٣
* کوانێ ڕەشەبا دەوێرێت — بەفری گەرم، ل١٤٣
* سلێمانی ناڕەحەت کات؟! — بەفری گەرم، ل١٤٤
* بە سەرماوسۆڵ بڵێین: نەیێت — بەفری گەرم، ل١٤٩
* بە بەفریش بڵێین: نەکەوێت — بەفری گەرم، ل١٤٩
* بە مانگیش بڵێین: زوو هەڵبێت — بەفری گەرم، ل١٤٩
* دەنا با بەفر لە خاکم سەرهەڵگرێت و — بەفری گەرم، ل١٤٩
* لەگەڵ خۆمدا هەڵم گرت تا گەیشتمە ئەو کوێرە گوندەی

زستانی پار *پەنای داین* و بەفری گەرم، ل١٥٠
* *پیرە شەویا*
بەکۆمەکۆم دێ و *هەواڵی* گەڕانەوەی
پەڕەسێلکە و پشکووتنی گەڵای داران *دەچرپێنێت* بەفری گەرم، ل١٥١
* با *لێی بپرسم* بەفری گەرم، ل١٥١
* *لە کزەبام پرسی*: لەکوێیت؟! بەفری گەرم، ل١٥٢
* *مانت گرتووە* ئەوێستا زوو زوو نایێیت؟! بەفری گەرم، ل١٥٢
* *گوتی*: بەفری گەرم، ل١٥٢
* دیسان *تیترواسکی* شەوگەڕ بەفری گەرم، ل١٥٣
* *درکی بەچ* مەرگ و پێشهاتێك *کردووە*؟! بەفری گەرم، ل١٥٣

**٣-٣-١-٢- بەتەنکردن**

کەچی ئەم لادانە بەرێژەی ١٧ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٧,٥٥٪ ی کۆی گشتی لادانە واتاییەکان.

ئاسمانێکی فراوانتر
بکەنە دەوار و کەپر بەفری گەرم، ل٩٧

لەزمانی خۆکاردا ئەو شتەی کە هەر یەکە لە دەوار و کەپری لێ دروست دەکرێ دەبێت سیمای جیاکەرەوەی واتایی [+تەن] ی هەبێت. لەبەرئەوەی لەم نموونەیەدا شاعیر ئاسمان دەکات بە کەپر و دەوار، بەم کارەی سیمای جیاکەرەوەی واتایی [+تەن] دەبەخشێت بەئاسمان و بەمەش بەتەنکردن روودەدات.

هەروەها:

سەری دانام
پەیژە ئاسا بەفری گەرم، ل١٠٧

ئەو شتەی کە لەزمانی خۆکاردا پەیژەی لێ دروست دەکرێ دەبێت سیمای جیاکەرەوەی واتایی [+تەن] ی هەبێت. لەم نموونەیەشدا چونکە شاعیر (سەر) ی کردووە بە پەیژە، ئەوا سیمای جیاکەرەوەی واتایی [+تەن] بەخشیوەتە تەن و بەمەش بەتەنکردنی دروستکردووە.

هەندێ نموونەی تر:

لە نێوان بەرداشی خاوی

کات

و

شوێنی

ئێرە نازیم — بەفری گەرم، ل١٠٨

بەلکو دلی تاشە بەردت نەرم ببێت و جارێك لێم — بەفری گەرم، ل١٢٢

* لاشەی ئەم خەونە دێرینە — بەفری گەرم، ل١٣٠

* دار و بەردە — بەفری گەرم، ل١٣٠

* بەخەون بەردی ئازاری ئەم ڕۆژگارە — بەفری گەرم، ل١٣٦

* دلم زەنوێری چیایوو — بەفری گەرم، ل١٤٠

* تا ئێوارە زەنوێری دڵ — بەفری گەرم، ل١٤٠

* کڕ وەکو بەرد دانیشتبوو — بەفری گەرم، ل١٤٢

* هەوری خەفەتی ڕادەمالێ — بەفری گەرم، ل١٤٣

تاخ یۆتە مشتێك خۆڵەمێش — بەفری گەرم، ل١٤٦

* چادرگاو کوالتووە دەروێش — بەفری گەرم، ل١٤٦

* مشتێك خۆشبەختیم بۆ بێنێت. . . — بەفری گەرم، ل١٥٦

### ٣-٣-١-٣- بەئەبستراکتکردن

بەمرۆڤکردن ٠ جار بینراوە کە دەکاتە ٪ ی هەموو لادانە واتاییەکان.

### ٣-٣-١-٤- بەرەوانکردن

لادانی بەرەوانکردن بەرێژەی ٤ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ١,٧٧٪ ی کۆی گشتی لادانە واتاییەکان.

بەخەیاڵمدا دێتەوە و بیر لە چاوە دەریاکانی دەکەمەوە — بەفری گەرم، ل١١٦

لێرەدا چاو بە دەریا چوێنراوە و دەریاش لە بەکارهێنانی زمانی خۆکاردا سیمای واتایی [+ ڕەوان]ی هەیە. ئەوا بەرەوانکردن ڕوویداوە.

هەروەها:

ئەم سترانە. . . کانیاو ئاسا — بەفری گەرم، ل١٤٥

لەم دەقەدا شاعیر سترانی چواندووە بە کانیاو و کانیاویش لە بەکارهێنانی خۆکاری زماندا سیمای واتایی [+ ڕەوان]ی هەیە. بەمەش هەوڵی داوە بەرەوانکردن دروست بکات.

هەندێ نموونەی تر:

* ***لافاوی*** سووری ***ڕق*** و ***تووڕەییم*** — بەفری گەرم، ل١٣٣
* - نەتزانیوە — بەفری گەرم، ل١٤٥

### ٣-٣-١-٥- بەئاژەڵکردن:

بەمرۆڤکردن ٢٧ جار بینراوە کە دەکاتە ١٢٪ ی هەموو لادانە واتاییەکان. سەیری ئەم نموونانە بکەن:

بۆ خۆم کۆتر ئاسا تێیدا هەڵبکورمێم — بەفری گەرم، ل١٠٣

لەم دەقەشیعرییەدا شاعیر خۆی وەکو کۆترێك نواندووە و کۆتریش لە بەکارهێنانی خۆکاری زماندا سیمای واتایی [+ ئاژەڵ][1] ی هەیە. بەمەش بەئاژەڵکردن روویداوە.

سیمرخی خەیاڵ دەگەڕێت — بەفری گەرم، ل۱۰۳

لێرەدا خەیاڵ وەکو سیمرخ پێشان دراوە و سیمرخیش لە بەکارهێنانی خۆکاری زماندا سیمای واتایی [+ ئاژەڵ]ی هەیە. بەمەش بەرەوانکردن روویداوە.

هەندێ نموونەی تر:

* ***تۆ شای پەری و باڵندانیت*** — بەفری گەرم، ل۹۳

* ***داڵیش ئاسا*** — بەفری گەرم، ل۹۳

* ***تۆ*** ئەو ***هەڵۆ*** بەرزە فڕە سەوداسەرە و ئەو ***باوکەشوورە*** پیرۆزە برینداره

شەکەت و عاسێیەی گورگ

لێرەو لەوێ ڕاویان ناوە و — بەفری گەرم، ل۹۵

* لە بەیانیڕا باڵندە و ***دارەکان ناحەوێنەوە*** — بەفری گەرم، ل۹۷

* ***پەرەسێلکەی ڕۆح*** پەرەوازە بوو — بەفری گەرم، ل۹۹

* بازانە لەسەر دوندێك ***هەڵنیشێت*** — بەفری گەرم، ل۹۹

* وس بن وا ***بەرد***

بەقەد بێدەنگیی سەدەها ***دەنەڕێنێت*** — بەفری گەرم، ل۱۰۲

* ***سیمرخی بیر*** — بەفری گەرم، ل۱۰۳

* هەمیشە ***سیمرخی خەونم*** دێتە هانا — بەفری گەرم، ل۱۰۸

* ***دەسوورێمەوە باز ئاسا*** — بەفری گەرم، ل۱۰۸

* ***خەڵکی*** شەیدا

***وەك پۆلە مەلی*** کۆچەری — بەفری گەرم، ل۱۱۲

* ***دەنووکی سۆز*** و ***گۆرانیم*** پێ لێکمەنێن — بەفری گەرم، ل۱۱٦

* ***ڕۆحی*** ڕەها — بەفری گەرم، ل۱۱۷

---

[1] - لێرەدا جیاوازی لەنێوان باڵندە و جۆرەکانی تری ئاژەڵدا نەکراوە، دەبەستمان لە ئاژەڵ هەر زیندەوەرێکە کە هۆشی نەبێ و بەمەش بەرامبەر دەبێ لەگەڵ مرۆڤ.

* *له بێچووه هەڵۆیەك دەچێت*  بەفری گەرم، ل١١٧
* سووره *نەهەنگی ناخم* خۆی وایه  بەفری گەرم، ل١١٨
* *هەڵۆی دڵی* نیازی وایه دەستەمۆبێت  بەفری گەرم، ل١١٨
* *هەڵۆی دڵیش*  بەفری گەرم، ل١١٩
* *ئێمەش* دوو *نێچیری* فەرخەی بێ دەردتان  بەفری گەرم، ل١٢٧

ئێمەش دوو نێچیری فەرخەی بێ دەردتان
خۆمان تێدا حەشاردەدا
وەك دوو *مەلی* دابڕاو لە ڕەوی کوێستان  بەفری گەرم، ل١٢٧
*باڵمان لەیەك وەردەهێنا*  بەفری گەرم، ل١٢٧
هێشتا *جاڵجاڵۆکەی ڕۆژگار*  بەفری گەرم، ل١٣٢

* *ڕۆح تەمیرێکی* جووت بزر و بێ داڵدەیه  بەفری گەرم، ل١٣٤
* *گوڵووکی* پەمەیی و سپی

دوور لەدەستی دڕندە و دێو
*پشیلەن*. . .  بەفری گەرم، ل١٣٨

* *ناخ نێچیری* بریندارە  بەفری گەرم، ل١٤٦

### ٣-٣-١-٦- پاڕادۆکس

کەچی ئەم لادانە واتاییە بەرێژەی ١٢ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٥,٢٢٪ ی کۆی گشتی بەکارهێنانی لادانە واتاییەکان.

گورگیش بمخوات
هەڵیش دێرێم
بست بەبست لەدوو شوونت دێم  بەفری گەرم، ل١١٥

لەم دەقە ئەدەبییەدا شاعیر سەرەتا پاڕادۆکسی لەنێوان دوو ڕستەی (گورگیش بمخوات، هەڵیش دێرێم) و ڕستەی (بست بەبست لەدوو شوونت دێم) دروستکردووە. ئەم پاڕادۆکسەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شاعیر لە دوو ڕستەکەی یەکەم گیانی لەدەست دەدات، کەچی لە ڕستەی سێیەمدا کارێك ئەنجام دەدات.

یان:

بەژیلە دانەپۆشراوە و داپۆشراوە بەفری گەرم، ل١٢٧

لێرەدا شاعیر سەرەتا دەڵێ: (بەژیلە دانەپۆشراوە) و دواتریش دەڵێ: (داپۆشراوە). لە کاتێکدا لە زمانی خۆکاردا ناکرێ لە یەك کاتدا شتێك دانەپۆشرابێ و داشپۆشرابێ.

هەندێ نموونەی تر:

* بە هەمان ***بۆنەی خەماویی*** جارانەوە بەفری گەرم، ل٩١

بەهەمان ***بۆنەی خەماویی*** جارانەوە بەفری گەرم، ل٩١

دەمگوت ئەمشەو ***بەفر گەرمە***

***گەرمە*** دەڵێیت ***پەنگرە*** لە دەستما بەفری گەرم، ل٩٧

وس بن وا ***بەرد***

بەقەد بێدەنگیی سەدەها دەنەڕێنێت بەفری گەرم، ل١٠٢

* ***ڕەشیی*** چاوێك

خۆرەتاوێك

بەژێرزەمینی سەردەم و

***سپیاتییەك***

بەزستانی سی و نۆ ساڵم دەبەخشێت بەفری گەرم، ل١٠٥

* کە لوتکەی ***دیار*** و ***نادیارە*** بەفری گەرم، ل١٣٦

* شەوگار بەشەوقی ***وێراوە*** و ***نەوێراوە*** بەفری گەرم، ل١٣٧

* ڕەهێڵەی بارانێك بێنن

***ئاوی*** کانی و ڕووبارەکان ***بشواتەوە*** بەفری گەرم، ل١٥٨

### ٣-٣-١-٧- بەرووەککردن

کەچی ئەم لادانە بەرێژەی ٢٠ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٨,٨٨٪ ی کۆی گشتی لادانە واتاییەکان. بڕوانە:

کێ ئەو دڵە ئازایەی لەسنگدا چاندوویت                    بەفری گەرم، ل٤

لەم نموونە یەشدا شاعیر یەکێك لە تایبەتییەکانی رووەك کە چاندنە بەخشیویەتی با
بەمەش بەرووەککردن رووی داوە.

منیش لەم چەمە ڕوابام                    بەفری گەرم، ل٩

لێرەدا شاعیر سیمای جیاکەرەوەی واتایی [+روان] کە یەکێکە لە تایبەتییەکانی ر
بەخشیویەتی بە من. ئەمەش بۆتە هۆی روودانی بەرووەککردن.

هەندێ نموونەی تر:

*تەمەنی* گەنجیت
*دادەرژا*                    بەفری گەرم، ل

*درەختەکانی* بەربای زستان *بوویت*                    بەفری گەرم، ل

*دڵت* لە *رەگوریشەوە هەڵکەنراوە*؟                    بەفری گەرم، ل١

* *رۆح* سەرلەنوێ *دەپشکوێت*                    بەفری گەرم، ل١

* هەن *تەمەنیان باخچەیەکە*                    بەفری گەرم، ل

* *هەندێکیش* لە *هی من* دەچێت                    بەفری گەرم، ل

* *دارهەنجیرێکی* زەردباوە                    بەفری گەرم، ل

* دیم زەردبووە                    بەفری گەرم، ل

* ئەو *پرتەقاڵە* جوانەی کە *خۆری* ناوە                    بەفری گەرم، ل١٢١

* لەوانەیە ڕۆژێك دابێت
*پشکۆیدات* و *گوڵ بگرێت*                    بەفری گەرم، ل

* دیارە ئەمساڵیش *درەختی*

حەزی مام گۆدۆ-ی بەسەزمان ناپشکوێت — بەفری گەرم، ل١٢٦

* یەك تاقە گوڵاڵە سوورەی ناخی من ناپشکوێنێت — بەفری گەرم، ل١٣٨

* دارخۆخێك بام — بەفری گەرم، ل١٣٩

* دڵم زەنوێری چیابوو — بەفری گەرم، ل١٤٠

* سەدان تەرزە گوڵی دابوو — بەفری گەرم، ل١٤٠

* گوڵێکی جوانم دەوەری — بەفری گەرم، ل١٤٠

* تا ئێوارە زەنوێری دڵ
هەموو گوڵەکانی قرتنا — بەفری گەرم، ل١٤٠

* گەسکێکی لەپەلکە سیس و ڕزیوەکانی ناخم دا — بەفری گەرم، ل١٤١

* ناخ داربەڕووی کلۆرە و تەویلی بەندیی — بەفری گەرم، ل١٤٦

هێلکاریی ژمارە -١٢ -

ەی بەکارهێنانی لادانە واتاییەکان لە دیوانی بەفری گەرمی نەوزاد ڕەفعەت

### ٢-٣-٢- لادانی لێکسیکی

لەو سەرچاوەیەی کە لەبەردەستدایە شاعیر ٤٥ جار دووچاری لادانی لێکسیکی بۆتەوە کە ڕێژەکەی دەکاتە ١٥,٨٤٪ و ئەمەش هەندێك لە تایبەتیەکانی شاعیرمان بۆ دەست نیشان دەکات.با لەو لادانە لێکسیکییانە وردبینەوە:

### ٣-٣-٢-١- لادانی لێکسیکیی داڕێژراو

ئەم لادانە بەرێژەی ٧ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ١٨,٤٢٪ ی کۆی گشتی لادانە لێکسیکییەکان.

چاوی ئەبلەقی تۆقین و ڕەشێنەی سپی هەڵگەڕاو          بەفری گەرم، ل٩٥

لێرەدا بەپێی یاسای (ناو+ێنە) ناوی رەشێنە داهێنراوە.

لە کوێ دەڕۆست شەوستانی ناخی من دێن!          بەفری گەرم، ل١١٩

لەم دەقە ئەدەبییەدا وشەی (شەوستان) بەپێی یاسای مۆرفۆلۆژیی (ناو+ستان) دروستکراوە.

هەندێ نموونەی تر:

* بازانە          بەفری گەرم، ل٩٣
* زیندانەوان          بەفری گەرم، ل٩٤
* بەفرستان          بەفری گەرم، ل٩٥
* ئاهەنگاویی          بەفری گەرم، ل١٠٣
* دارینە          بەفری گەرم، ل١٢٣

### ٣-٣-٢-٢- لادانی لێکسیکیی لێکدراو

ئەم لادانە بەرێژەی ٣١ جار بەکارهاتووە کە دەکاتە ٨١,٥٨٪ ی کۆی گشتی لادانە لێکسیکییەکان.

شەکرە کۆتری نامەبەر — بەفری گەرم، ل٩٦

وشەی شەکرە کۆتر بەپێی یاسای (ناو+د+ناو) داهێنراوە.

خۆزنامە دەخوێنێتەوە — بەفری گەرم، ل١٠١

لەم دەقە شیعرییەدا وشەی خۆزنامە بەپێی یاسای (ناو+ناو) درووت بووە.

هەندێ نموونەی تر:

* باوکە شوور — بەفری گەرم، ل٩٥
* کۆچبار — بەفری گەرم، ل٩٧
* سووردەچنەوە — بەفری گەرم، ل٩٧
* شەوبێدار — بەفری گەرم، ل١٠١
* کاتشوێن — بەفری گەرم، ل١٠٣
* ئاگری شەختەڕەوێنی — بەفری گەرم، ل١٠٤
* شوێنەزا — بەفری گەرم، ل١٠٨
* شەو درەنگان — بەفری گەرم، ل١١٠
* کارەسات دیو — بەفری گەرم، ل١١٢
* ڕەشەڕاو — بەفری گەرم، ل١١٦
* جوانی شێوێن — بەفری گەرم، ل١٢٥
* ئێوارەوەخت — بەفری گەرم، ل١٢٧
* شەودرەنگان — بەفری گەرم، ل١٢٨
* پیرە شەمەندەفەر — بەفری گەرم، ل١٢٨

لەم دەقە شیعرییەدا شاعیر هەوڵی داوە لە ڕێگەی تێکشکاندنی جۆری نووسینی باو دەقەکەی خۆی بەرجەستە بکات و لادانی نووسینی ئەنجام بدات. شاعیر لێرەدا پەیوەندی لە نێوان شێوەی فڕین و وشەی فریندا دروستکردووە لەکاتێکدا لە زمانی خۆکاردا پەیوەندییەکی ئاوا لە ئارادا نییە.

یان بڕوانە:

سەری دانام
پەیژە ئاسا
بەرەو ژوورتر
پێی سەرکەوێت
کەچی کەمژە
هەر پێی دانا
سەر بەرەو ژێر
بۆ دۆزەخ و
گەرووی هەڵدێر
هەڵخلیسکا
نەیدەزانی
هەموو سەرێك
بۆ پرد و پەیژە
دەست نادات
هەموو سەرێك
سەری ناخات

بەفری گەرم، ل١٠٧

لێرەشدا شاعیر بەلادان لە شێوەی نووسینی باو و دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان شێوەی نووسین و ناوەڕۆکی نووسینەکە دروست بکات.

هەندێ نموونەی تر:

*پەشیمانیت لەو فرمێسکە درشتانەی کە تا دەمی بەری بەیان
بۆ گراوی و کات و شوێنێکی ئیرەمیت
د
ە
ب
ا
ر
ا
ن
د
ن؟!

بەفری گەرم، ا

* لەنێو بەفرو بەستەڵەکدا
لە تووڵەڕێی
هەڵەموت و
بەردەڵانی
نشێوان و
کەندولەند و
زوورگ و هەڵەتدا
پێت دەگوا؟!

بەفری گەرم،

* زەنگوڵ
زەنگوڵ
ئاردق
یاخود

تك

تك

خوێنی

سەدەهات

لێ هەڵدەقوڵا ؟!

تەمەنی گەنجیت

دادەڕژا

گەڵا

گەڵا ؟!

پەشیمانیت؟!

بەفری گەرم، ل٩٤

هێلکاریی ژمارە -١٣-

ەی بەکارهێنانی لادانە لێکسیکییەکان لە دیوانی بەفری گەرمی نەوزاد رەفعەت

**٣-٢-٣- لادانی نووسینی:**

کەچی ١٤ جار بەکارهاتووەکە دەکاتە ٤,٨٩٪ ی هەموو لادانەکان.

شەکرە کۆتری نامەبەر

*

بەسەرتاپای دەگێڕێت و بەفری گەرم، ل٩٥

**مانی نموداری پووت و لاپاڵ و ترۆپك و شیوی ماه و زەردی بەفوستاندا**

* هەندێك شەو هەن

زرینگانەوەی شکانی:

ئـ . . یـ . . نـ . . جـ . . ا . . نـ . . ە . . یـ . . ە . . کـ . . ی

د . . ە . . گـ . . مـ . . ە . . نـ . . ی . . کـ . . ر . . یـ . . سـ . . تـ . . ا . . ڵـ . . یی

بەفری گەرم، ل١١١

* ئارەقی سەد

هەورازی ڕك و

هەڵدێری

کووڕی

هەزار بەهەزاری

تریشم لەبەر بچۆڕێت

بەفری گەرم، ل١١٤

* لەدواشییەوە
تك
تك
تك
تك
خوێنی دەتکا. . .

بەفری گەرم، ل١٢٩

* هەمان لایلایەم بۆ بڵێرەوە
خەوم ز. . ڕ. . ا. . وە
خە. . و. . م. . ز. . ڕ. . ا. . و
خە. . و. . م. . ز
خە. . و. . م
خە. . ە. . و
خ. . ە
خ

بەفری گەرم، ل١٣٥

*

سبەینێ
کەهاتمە دەرێ
دڵم زەنوێری چیابوو
سەدان تەرزە گوڵی دابوو
کەچی لەڕێگا هەر تابلۆ و سیمایەکی گرژم دەدی

گوڵێکی جوانم دەوەری
تا ئێوارە زەنوێری دڵ
هەموو گوڵەکانی قرنا
تاقە گوڵێکی تیا نەما
خۆشەویستێك
بۆنی بکات

بەفری گەرم، ل٠

* 
ت
ێ
چ
ە
د
ڵ
ە
ھ

بەفری گەرم، ل٣

* ڕاوچییەکم لێوە دیارە
بەچنگەڕنێ بەخڕو
لاپاڵی ڕژد و
کۆچەڕێی
شوێنی عاسێی
بە تەمومژ و هەوردا
هەڵدەگەڕێت

بەفری گەرم ل١٥٤

❋

د د د د د د د د د د د د د د

ه ه ه ه ه ه ه ه ه ه ه ه ه ه ه

ب ب ب ب ب ب ب ب ب ب ب ب ب

ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا ا

ر ر ر ر ر ر ر ر ر ر ر ر ر ر ر ر ر ر

ێت ێت ێت ێت ێت ێت ێت ێت ێت ێت؟

بەفری گەرم، ل١٥٥

هێلکاریی ژمارە -١٤-

ڕێژەی بەکارهێنانی هەر سێ لادان لە دیوانی بەفری گەرمی نەوزاد ڕەفعەت

## ٤- ئەنجامەکان

### ١-٤- شیکردنەوەی ئەنجامەکان

#### ٤-١-١- ئەنجامە پراکتیکیەکان

١- زۆرترین لادان لای هەریەکە لە فەرهاد پیربال، ئەنوەر مەسیفی و نەوزاد رەفعەت لادانی واتاییە. ئەم لادانە بەرێژەی ٩٠,٧٤٪ کە بەرزترین ریژەیە بە بەراورد لەگەڵ فەرهاد پیربال کە بە رێژەی ٨٤,٧٢٪ یە و نەوزاد رەفعەت بەرێژەی ٧٨,٦٧٪ یە.

هێڵکاریی ژمارە -١٥ -

رێژەی بەکارهێنانی لادانی واتایی لای فەرهاد پیربال، ئەنوەر مەسیفی و نەوزاد رەفعەت

٢- دووەم لادان لەرووی ڕێژەی بەکارهێنانەوە لادانی لێکسیکییە. ئەم لادانەش
ی هەریەکەیان بەم ڕێژانە نەوزاد ڕەفعەت ١٦,٤٣٪ ، ئەنوەر مەسیفی ٩,٢٥٪ و
رهاد پیربال ٨,٥٥٪ .

هێلکاریی ژمارە -١٦-

ڕێژەی بەکارهێنانی لادانی لێکسیکی لای فەرهاد پیربال، ئەنوەر مەسیفی و نەوزاد ڕەفعەت

٣- هەرچی لادانی نووسینییە لای فەرهاد پیربال ٦,٧٢٪ ، نەوزاد ڕەفعەت
,٤٪ و ٠٪ . ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە فەرهاد پیر بال لە ڕێگەی زیاتر
نابوونی بە شاعیرانی ئەوروپی و بە تایبەتی شاعیرانی فەرەنسی وەك ئاپۆلۆنێر و
هتد کە ڕۆڵێکی گەورەیان لە بواری لادانی نووسینی بینیوە.

هێلکاریی ژمارە -١٧-

ڕێژەی بەکارهێنانی لادانی نووسینی لای فەرهاد پیربال، ئەنوەر مەسیفی و نەوزاد ڕەفعەت

٤- ئەوەی جێگەی سەرنجە لە لادانی واتاییدا شیعرەکانی ئەنوەر مەسیفی زۆرترین ڕێژەی بەرکەوتووە. بەلام لە لادانی لێکسیکیدا ئەم ڕێژەیە (زۆرترین ڕێژە) بەر شیعرەکانی نەوزاد ڕەفعەت کەوتووە. کەچی لە لادانی نووسینیدا ڕێژەکە بەر فەرهاد پیربال کەوتووە. ئەمەش بۆ شێوازی هەریەکە لە شاعیرەکان دەگەڕێتەوە لە چۆنیەتی سوود وەرگرتن لە کەرەسەکانی زمان.

٥- ژمارەی لادانەکان و رێژەی سەدی هەر یەکەیان لەم خشتەیەدا رووز
کراوەتەوە:

| جۆری لادان | فەرهاد پیربال | | ئەنوەر مەسیفی | | ئەوزاد رەفعەت | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارەی لادان | لەسەدا | ژمارەی لادان | لەسەدا | ژمارەی لادان | لەسەدا |
| بەمرۆڤ کردن | ٢٩٥ | ٦٠,٠٨ | ١١٢ | ٪٤١,٧٩ | ١٤٥ | ٪٥١,٠٦ |
| بەئاژەڵ کردن | ٢٨ | ٪٥,٧٠ | ٢٣ | ٪٨,٥٨ | ٢٧ | ٪٩,٥٠ |
| بەئەبستراکت کردن | ١٦ | ٪٣,٢٥ | ١٢ | ٪٤,٤٧ | ٠ | ٪٠ |
| بەتەن کردن | ٢٨ | ٪٥,٧٠ | ٤٣ | ٪١٦,٠٦ | ١٧ | ٪٥,٩٨ |
| بەرەوان کردن | ٣ | ٪٠,٦١ | ١٤ | ٪٥,٢٢ | ٤ | ٪١,٤٠ |
| بەروودك کردن | ٣٠ | ٪٦,١٠ | ١٦ | ٪٥,٩٧ | ٢٠ | ٪٧,٠٤ |
| پارادۆکس | ١٦ | ٪٣,٢٥ | ١٥ | ٪٥,٥٩ | ١٢ | ٪٤,٢٢ |
| واتایی | ٤١٦ | ٪٨٤,٧٢ | ٢٤٥ | ٪٩١,٤١ | ٢٢٥ | ٪٧٩,٢٢ |
| لێکدراو | ١٢ | ٢,٤٤ | ١٢ | ٪٤,٤٧ | 31 | ٪11.19 |
| دارێژراو | ٣٠ | ٪٦,١٠ | ١١ | ٪٤,١٠ | 7 | ٪2.52 |
| لێکسیکی | ٤٢ | ٪٨,٥٥ | ٢٣ | ٪٨,٥٨ | 38 | ٪13.71 |
| نووسینی | ٣٣ | ٪٦,٧٢ | ٠ | ٪٠ | ١٤ | ٪٤,٨٩ |

خشتەی ژمارە-١-

ژمارەی لادانەکان و رێژەی سەدییان

## ١-٢-٤- ئەنجامە تیۆریەکان

١- هەریەکە لە فەرهاد پیربالّ، ئەنوەر مەسیفی و نەوزاد رەفعەت، لە شیعرەکانی خۆیاندا زیاتر سوودیان لە لادانی واتایی وەرگرتووە وەك لە لادانەکانی تر. ئەمەش وانەبیّ تەنها لای ئەم شاعیرانە بەڵکو لای شاعیرە فارسەکانیش کە لە لایەن (**سجودی**، **أفراسیابی** و **ستودە**) ەوە لێیان کۆڵراوەتەوە بەهەمان شێوە بووە. ئەمەش بە بڕوای ئێمە ئەوە دەگەیەنیّ کە واتا بەرزترین رۆڵی هەیە لە خولقاندنی زمانی شیعر.

٢- شاعیرەکان بە سوود وەرگرتن لە پاشگر و پێشگر و وشەکانی زمان و بەپەیڕەوی کردن لە یاسا مۆڕفۆلۆژییەکانی زمان هەوڵ دەدەن وشەی تازە بخەنە نێو زمانەکەیان یاخود وشەی تازە بخەنەوە، ئەمەش بەپێچەوانەی زمانی خۆکار.

٣- ئەم باسە نموونەیەکە لە دەسکەوتەکانی زمانەوانی لە بواری لێکۆڵینەوە لە ئەدەبیات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنیّ کە دەتوانین سوود لە زمانەوانی وەربگرین بۆ لێکۆڵینەوە لە ئەدەبیات.

٤- ئەم باسە نیشانەی ئەوەیە زمانەوانی رۆڵێکی گرنگی هەیە لە رەخنەی ئەدەبییدا و رەخنەگری ئەدەبی دەبیّ شارەزای زمانەوانی و بنەما زمانەوانییەکان بیّ.

٥- ئەم باسە یارمەتی ئەو لێکۆڵەرانە دەدات کە ئارەزووی ئەوەیان هەیە لێکۆڵینەوەی قووڵتر و وردتر لە شیعری ئەم شاعیرانەدا ئەنجام بدەن.

٦- ئەم باسە یاریدەدەرێکیشە بۆ ئەو مامۆستایانەی کە ئەدەبیاتی تازە بە قوتابیانی زمان و ئەدەبیاتی کوردی دەڵێنەوە.

٧- بەکارهێنانێکی تری ئەم باسە لە بواری شێوازناسیی ئەدەبیە و لایەنێکی شێوازی هەریەکە لەم شاعیرانەی پێشانداوە.

# فەرهەنگۆک(*)

| کوردی | فارسی | ئینگلیزی |
| --- | --- | --- |
| ئەرکی دەرکەوتن | | representational function |
| ئاشنایی سڕینەوە | اشنایی زدایی | Making strange |
| ئەرکەکانی زمان | نقشهای زبان | Functions of Language |
| ئەرکی ئەدەبی | نقش ادبی | Poetic function |
| ئەرکی دەربڕین | | expressive function |
| ئەرکی دەرکەوتن | | |
| ئەرکی دەقی | | textual function |
| ئەرکی گەڕانەوەیی | | referential |
| ئەرکی عاتفی | | emotive |
| ئەرکی میتازمانی | | Metalinguistic |
| ئەرکی تێوگەسی | | interpersonal function |
| ئەرکی هاندەری | | conative |
| ئەرکی هاودڵی | | phatic |
| ئەرکی هزردکی | | ideational function |
| بەئاژەڵکردن | حیوان پنداری | |
| بەئەبستراکتکردن | تجریدگرایی | |
| بەبەرجەستەکردن | جسم پنداری | |
| بەتەنکردن | | |
| بەرەوانکردن | سیال پنداری | |
| بەڕووەککردن | گیاه پنداری | |
| بەزیندووکردن | جاندار پنداری | Abstractness |
| بەمرۆڤکردن | انسان پنداری | Personification |
| پارازمان | | paralanguage |
| پارادۆکس | پارادوکس | Paradox |
| پەیام | پیام | Message |
| تەریببوون | توازن | elismparall |
| جۆر | پیش نمونه | Prototype |

(*) ئەو زاراوانەی کە بەرامبەرە ئینگلیزییەکەیان نییە لە داهێنانی نووسەرە فارسەکان

| | | |
|---|---|---|
| Literary jeners | انواع ادبیات | جۆرەکانی ئەدەبیات |
| Automatization | خودکاری | بەخۆکارکردن |
| repetition | تکرار | دووبارەبوونەوە |
| exrtra regularity | قاعیده افزایی | ڕێسازیادکردن |
| foregrounding | برجستەسازی | زەقکردنەوە |
| Register | سبك | شێواز |
| Canel | کانال | کەناڵ |
| Deviation | هنجارگریزی | لادان |
| Phonological Deviation | هنجارگریزی نوایی | لادانی دەنگناسی |
| Syntactical Deviation | هنجارگریزی نحوی | لادانی رستەسازی |
| | هنجارگریزی دستوری | لادانی ڕێزمانی |
| Dialectical Deviation | هنجارگریزی گویشی | لادانی زاری |
| Deviation of Register Type | هنجارگریزی سبکی | لادانی شێوازی |
| discoursal deviation | هنجارگریزی گفتمانی | لادانی گوتاری |
| Deviation of Historical Period | هنجارگریزی زمانی | لادانی کاتی |
| Lexical Deviation | هنجارگریزی واژگانی | لادانی لێکسیکی |
| Graphological Deviation | هنجارگریزی نوشتاری | لادانی نووسینی |
| Semantic Deviation | هنجارگریزی معنایی | لادانی واتایی |
| Morphological Deviation | هنجارگریزی صرفی | لادانی وشەسازی |
| sender | فرستندە | نێرەر |
| Symbol | نشانە | هێما |
| Receiver | گیرندە | وەرگر |
| Connotative | | وروژاندن |

# ملخص البحث

هذه الرسالة الموسومة بـ (بعض انزياحات اللغوية لدى ثلاثة شعراء من المستحدثين الكورد).كانت السبب الذى حثنى على اختيار الكتابة فى هذه الرسالة مع غياب الأبحاث الاكاديمية فى هذا الموضوع.

الرسالة تحتوى على مقدمة و ثلاثة فصول و نتائج و ملحق. فى المقدمة عنوان الرسالة،اسباب اختيار الموضوع ، مشاكل البحث، منهج البحث، اهداف البحث، اهمية البحث، ثم ملخص البحث.

الفصل الاول: يبين علاقة علم اللغة بالعلوم الاخرى، وكذالك وظائف اللغة- الوظيفة اللغوية(الشعرية)- مع موجز تأريخى حول عدول، انواع اللغة الادبية بشكل عام، ثم انواع اللغة الادبية الكردية بشكل خاص.

الفصل الثانى : شرحنا فى هذا الفصل بشكل مفصل انواع العدول وعرضنا بعض النصوص الادبية كنماذج للتوضيح.

الفصل الثالث: يتناول هذا الفصل كل من العدول المعنوية،المفرداتية و الخطية فى شعر فرهاد بيربال، انور مسيفى، و نوزاد رفعت.

وأخيراً ذكرنا النتائج التى توصلنا اليها و عرضنا الملحق للشعراء الثلاث المستحدثين.

## ABSTRACT

This research deals with the some deviations in the poetry of hree modern kurdish Poets.Till now, no academic thesis has een done about the deviation in Kurdish language.

This thesis consists of introduction, three chapters, conclusion, and appendix. The introduction includes the title, he reasons of choosing it, problems, the research methodology, he purpose of it, the importance of topic, and the summary of he thesis in Kurdish.

Chapter one consists of six sections:

First section: The relation between linguistics and the other ciences.

Second section: The functions of language.

Third section: The literary function.

Fourth section: A brief introduction about deviation.

Fifth section: The prototypes of literary language.

Sixth section: The prototypes of Kurdish literary language.

Chapter two consists of the types of deviation,providing some examples of literary texts.

Chapter three: The analysis of the items, here semantic, exical, and graphological deviations have been explained in he poetry of Farhad Pirbal, Anwar Masify, and Nawzad Rafat.

Finally we have got some conclusions, with the appendix heir poems.

# سەرچاوەکان


## سەرچاوە کوردییەکان:

- محمد معروف فتاح (دکتۆر)، زمانی شیعر- روانگەیەکی زمانەوانی و پراکتیکی، دەستنووس
- عبدالواحد مشیر دزەیی (دکتۆر)، لادانی واتایی لە زمانی شیعردا- لێکۆڵینەوەیەکی پراگماتیکیە، مجلە کلیە اللغات، جامعە بغداد، بغداد، ع ١٣، ٢٠٠٧.

## سەرچاوە فارسییەکان

### فرهنگ

- ابراهیم چنگی، (١٣٨٢) فرهنگ دائره المعارفی زبان و زبانها، بهنام.
- سیما داد، (١٣٨٣) فرهنگ اصطلاحات ادبی- واژەنامەء مفاهیم و اصطلاحات ادبی فارسی و اروپایی (تطبیقی و توضیحی) ، انتشارات مروارید، تهران، چاپ دوم.
- عربعلی رضایی، (١٣٨٢) فرهنگ توصیفی اصطلاحات ادبی انگلیسی- فارسی، فرهنگ معاصر، تهران.
- میمنت میر صادقی (ذو القدر)، (١٣٨٥) واژدنامەء هنر شاعیری، فرهنگ تفصیلی اصطلاحات فن شعر و سبك ها و مكتب های آن، كتاب مهناز، تهران، چاپ سوّم.

### پایان نامە

- محسن نورپیشە قدیمی، (١٣٨٢) اشنایی زدایی در شعر یدالله رؤیایی، رسالە کارشناسی ارشد، دانشگاه گیلان، دانشکدە ادبیات و علوم انسانی-گروه زبان و ادبیات فارسی.
- منصور ستودە ، (١٣٨٣) بررسی موارد آشنایی زدایی و برجستەسازی در اشعار مهدی اخوان ثالث، رسالە کارشناسی ارشد،دانشگاه شیراز.

### کتاب

- جولیا اس. فالك، ت: خسرو غلام علی زادە، (١٣٧٧)،زبان شناسی و زبان — بررسی مفاهیم بنیادی زبان شناسی،آستان قدس رضوی، تهران، چاپ پنجم.

❖ جین ایچسون، محمد فائض(۱۳۸۰)، مبانی زبانشناسی، نگاه، تهران.

❖ حسن خواجه‌ای(۱۳۸۵)، روان شناسی زبان، دانش آرا، تهران.

❖ رابرت اسکولز، ت: فرزان طاهری، (۱۳۸۳) درآمدی بر ساختارگرایی در ادبیات آگاه، چاپ دوّم، تهران.

❖ راجرفالر و دیگران، ت: مریم خوزان، حسین پاینده، (۱۳٦۹) زبانشناسی و نقد ادبی نشر نی، تهران.

❖ ریچارد هارلند، ت: گروه ترجمه‌ی شیراز: علی معصومی و شاپور جورکش (۱۳۸۵) درآمدی تاریخی بر نظریه ادبی از افلاتون تا بارت، تهران، چاپ دوم.

❖ سروس شمیسا، (۱۳۸۵) نقد ادبی ، میترا، تهران، ویرایست دوم.

❖ کورش صفوی، (۱۳۷۲) از زبان شناسی به ادبیات ( جلد اول- نظم)، چشمه تهران.

❖ کورش صفوی، (۱۳۸۰) از زبان شناسی به ادبیات- جلد دوم: شعر، حوزه هنری تهران.

❖ علی محمد حق شناس، (۱۳۷۱) (( نظم، نثر و شعر: سه گونه‌ی ادبی)) در:مجموعه‌ی مقالات دومین کنفراس زبانشناسی نظری و کاربردی، سید علی میر عماد (گردآورنده). دانشگاه علامه طباطبایی.

❖ محمد رضا باطنی، (۱۳۷٦)، آگاه، چاپ دوّم، تهران.

❖ محمد رضا شفیعی کدکنی، (۱۳٥٤) موسیقی شعر، امیرکبیر، تهران.

❖ مریم خلیلی جهانتیغ(دکتر)، (۱۳۸۰) سیب باغ جان ((جستاری در ترفندها و تمهیدات هنر غزل مولانا))،انتشارات سخن، تهران.

❖ مهران مهاجرو. . ، (۱۳۷٦) به‌سوی زبانشناسی شعر- ره یافتی نقشگرا، مرکز،

❖ مهیار علوی مقدم، (۱۳۸۱) نظریه های نقد ادبی معاصر (صورتگرایی ساختارگرایی) باگذری بر کاربرد این نظریه‌ها در زبان و ادب فارسی، سمت، تهران، چاپ دوم.

❖ ویلیام هیوز، ت: سید محمد علی میر عمادی(دکتر)، تفکر نقادانه- مقدمه‌ای مهارتهای بنیادی، قلمستان هنر، تهران.

❖ یوهانس ویلم برتنز، ت: فرزان سجودی، (۱۳۸۲) نظریه ادبی، آهنگ دیگر، تهران.

➢ **روزنامه**

❖ فرزان سجودی، (۱۳۷٦) درآمدی بر نشانەشناسی شعر، کنفراس چهارم زبان
شناسی، دانشگاه علامه طباطبایی

❖ فرزان سجودی، (۱۳۷۷) هنجارگریزی در شعر سهراب سپهری، کیهان فرهنگی،
ص ۱٤۲.

**سەرچاوە ئینگلیزییەکان**

Leech,N, (1969) A Linguistic Guide to English Poetry, Longman
London.

**سەرچاوەی نموونەکان:**

**کتێب**

❖ شێخ مەعروفی نۆدێ، راست کردنەوە و وێنەدارکردنی/عبدالرحیمی
مەحموودی،لۆغەت نامەی ئەحمەدی وێنەدار، ؟

❖ عەلائەدین سەجادی، (۲۰۰۰) مێژووی پەخشانی کوردی، ئاراس، هەولێر.

❖ فەرهاد پیربال، (۲۰۰۵) پێنج کتێب و نیو، کتێبی یەکەم Exil ، ناوەندی
چاپەمەنیی رۆژهەڵات، سلێمانی.

❖ مەلا عبدالکریی مدرس، (۱۹۹۱) بەدیع و عەرووزی نامی.، دار
الجاحظ،بەغدا

❖ نەوزاد رەفعەت، (۲۰۰٤) پەرییەکان هەڵدەفڕێنمەوە، بەفری گەرم، ئاراس،
هەولێر.

**گۆڤارەکان:**

❖ ئەحمەد مستەفا نەجمەدین،(۱۹۹٦).

❖ ئەنوەر مەسیفی، (۲۰۰۵) جارێکی تر خۆر باران، کۆواری شین، ژ/ ۱٥.

❖ جەبار جەمال غەریب، (۲۰۰۷) سازی ئەفسووناوی جیهان، رامان، ژ/۱۲٤.